[ الى هنا م ـ ١٠٢/٣ ببعض فرق ] فأرسل معه رجلاً أو رجالا الى الكوفة ، فسأل عنه أهل الكوفة ، ولم يدع مسجداً إلا سأل عنه ويثنون عليه معروفاً • حتى دخل مسجداً لبني عبس فقام رجل منهم يقال له : أســامة بن قتادة ، يكنى أبا سَعْدة قال : أما إذ نشدتنا فإن سعداً كان لا يَسَيَّرُ بالسريـة [ أي جبان ] ، ولا يقسم بالســوية • [ أي ـ ][1] ولا يعدل في القضية [ أي ظالم ] قال ســعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أما والله لأدعونَّ بثلاث : أللهم إن كان عبدك هذا كاذباً قام رياء وسمعة فأطل عمره ، وأطل فقره ، وعرضه بالفتن •

قال [ عبدالملك الراوي عن جابر ] : وكـان بعـد إذا سُـئِل يقول : شيخ كبير مفتون أصابتني دعوة سعد • قال عبدالملك : فأنا رأيته قد سقط حاجباه على عينيه من الكبر • وإنه ليتعرض للجواري في الطريق يغمزهن •

ح ـ ٧٨/٢ • د ، ن •

وفي أخرى خصرى : فأمد في الأولين ، وأحذف في الأخريين ، ولا آلو ما اقتديت به من صــلاة رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ •••

ح ـ ٨٧/٢ •

**تەرجەمە :**

جابیری کوڕی سەمورە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەهلی کووفە سەعدی ئەبو وەقاصیان لای عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ شکات کرد • عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەزلی کرد عەمماری کوڕی یاسیری ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە جێی دانا کردی بە ئەمیریان ، وایان شـــکات

(١) دانەر ـ خ ـ ئەمەی هەر وا بە بۆشیی دانابوو •

لێ کرد حەتتا وتیان : نازانێ چاك نوێژمان پێ بکا ! ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ ناردی بەشوێنیا فەرمووی : ئەی ئەبو ئیسحاق ئەمانە ئەڵێن : نازانی ظەریف نوێژیان بۆ بکەی ! فەرمووی : = عەرەبی دەشتەکیی من فێری نوێژ ئەکەن ! = وەللاهی من نوێژی وەك نوێژی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ یان پێ ئەکەم ، هیچی لێ کەم ناکەم ؛ نوێژی خەوتنان ئەکەم لە دوو رکاتی ئەوەلا رائەوەستم طوولی پێ ئەدەم ، دوو رکاتی ئاخریی بەتەخەفیفەوە ئەکەم ، هیچ قوصوور ناکەم لەوە کە پەیڕەویم کردوە بە نوێژی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ، ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ظەننی من بە تۆ وایە کە وتت ،

پیاوێ ، یا چەند پیاوێکی ، لەگەڵ نارد بۆ کووفە ، هیچ مزگەوتێ نەما کە دەرحەق سەعد لێیان نەپرسن هەموو ثەنایان لەسەر کرد ، تا هاتنە سەر مزگەوتێکی بەنی عەبس ، پیاوێکی ئوسامە ناوی کوڕی قەتادە کە بە ئەبوسەعدە کونیەی نرابوو وتی : کە ئێوە سوێندمان ئەدەن : سەعد ترسنۆکە لە حەربا شەبەیخوون ناکا بەسەر دوشمنانا ، بە موساوات تەقسیمی غەنائیم ناکا ، لە موحاکەمەدا عەدالەت بەجێ ناهێنێ ! سەعد ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : سێ دۆعات لێ ئەکەم : خوایا ئەگەر ئەم پیاوە درۆ ئەکاو بۆ ریاو شوهرەت هەڵساوە عومری درێژ بکە ، فەقیرێتی درێژ بکە ، تووشی فیتنەی بکە !

عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر ، کە لە جابیرەوە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ریوایەت ئەکا ، ئەفەرموێ : لە دوای ئەو دۆعایە کە لێیان پرسیایە : بۆچ وات لێ هاتوە ؟ ئەیوت : شێخێکی پیری تووشی فیتنەبووم ، دۆعای سەعدم لێ گیرا بوو ، عەبدولمەلیك ئەفەرموێ : چاوم پێیکەوت لەبەر

پیریی برۆی بەسەر چاویا داکەوتبوو لـە ڕێگەدا دەستی بە لای ژنـانـەوە ئەبردو ئەیگوشین •

سەعدی بنی وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ ( مســـتجاب الدعوة ) بوو ، فەضائیلی لە فەضائیلا[1] بەیانکراوە ، حاجەت بە تیکراری نیە •

لە نوێژی چوار ڕکاتیو سێ ڕکاتییی دوو ڕکاتی ئەوەڵ لە دوو ڕکاتی دوایی طوولی زیاتر پێ بدرێ •

لازمە ئینســـــــان خۆی لە ( أولیاء الله ) پیاوباش بپارێزێ ، دڵیان نەشکێنێ ، قسەیان دەرحەق نەکا ، چونکی دوشمنی دۆست بە دوشـــمن حسێبە • وای بە حاڵی کەســێ کــە دوشـــمنایەتیی لەگەڵ خوا بکا ! ـ عز وجل ـ ( ألا أنا أحب من أحبه الله ، وأرجو أن يكون ملا حسين منهم ـ أدامه الله ـ ) •

٢٠٧٢/٧ ـ عن جابر بن سمُرة [ رضي الله تعـالى عنهما ] كـان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقرأ في الظهر بالليل إذا يغشى وفي العصر نحو ذلك ، وفي الصبح أطول من ذلك •

٢٠٧٣/٨ ـ وفي أخرى عنه : يقرأ في الظهر بسبح اسم ربك الأعلى ، وفي الصبح بأطول من ذلك • م ـ ٣/١٠٧ •

٢٠٧٤/٩ ـ عن أبي برزة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان يقرأ في صلاة الغداة من الســـتين الى المائـة • = م ـ ٣/١٠٨ = •

(١) بڕوانە : ل : ( ٤٨٩ )ی بەرگی سێیەمی ئەم کتێبە .

**تەرجەمە :**

جابیری کوڕی سەمورە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ لە نوێژی نیوەڕۆدا ( والليل إذا يغشى )ی ئەخوێند • لە نوێژی عەصرا بە قەد ئەو ، لە نوێژی سبەینانا زیاتــر لەوە • لە ریوایەتەکەی تریا لە نیوەڕۆدا ( سبح اسم )ی ئەخوێنـــد • ئەبوبەرزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە نوێژی سبەینانا لە شەصت ئایەتەوە تا صەد ئایەتی ئەخوێند •

١٠/٢٠٧٥ ـ عن عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : كان رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليــه وسـلم ـ يســـتفتح الصـــلاة بالتكبير والقراءة بالحمد لله رب العالمين ، وكان إذا ركع لم يشخص رأسه ولم يصوبه ، ولكن بين ذلك • وكان إذا رفع رأسه من الركوع لم يسجد حتى يستوي قائماً • وكان إذا رفع رأسه من السجدة لم يسجد حتى يستوي جالساً • وكان يقول في كل ركعتين التحية ، وكان يفرش رجله اليسرى وينصب رجـله اليمنى • وكان ينهى عن عقبة [ عَقِبِ • أخرى ] الشـــيطان [ أي الإقعاء كالـكلب والسباع • نووي ] • وينهى أن يفترش الرجل ذراعيه افتراش الســـبع ، وكان يختم الصلاة بالتسليم • م ـ ٣/٢٨٨ •

١١/٢٠٧٦ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] يقول : كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا نهض من الركعة الثانية إستفتح القراءة بالحمد لله رب العالمين • م ـ ٣/٢٨٨ •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە ( الله أكبر )و فاتیحە دەســــــتی بە نوێژ ئەکــرد ، یەعنی

( الله أكبر )ی ئەكرد ئەمجا فاتیحای ئەخوێند • كە تەشـــریفی بچوایە بۆ روكووع سەری بەرز نەئەكردەوەو دای نەئەنەوان ؛ لە بەینی ئـەو دوانەدا ئەبوو ، كە سەری لە روكووع بەرزبكردایەوە تا راست رانەوەســـتایە سوجدەی نەئەبرد،كە سەری لە سوجدە بەرزبكردایەوە تا راست دانەنیشتایە نەئەچوو بۆ سوجدەی دوەم ، لە كوللی دوو ركاتێكا تەحییاتی ئەخوێند • لە تەحییاتا پێی چەپی پاڵەخستو پێی راستی هەڵەنا • نەهی لەوە ئەكـرد كە ئینسان وەك حەیوانی درِندە لەسەر سمتی دابنیشێو ئەژنۆی هەڵبنێ ، كە دانیشتنی شەیطانە • نەهی لەوە ئەكرد كە پیاو هەردو ذیراعی لەســەر ئەرز رابكێشێ وەك حەیوانی درِندە • خەتمی نوێژی بە سەلام ئەكرد •

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كە تەشریفی لە ركاتی دوەم هەڵبســتایەوە دەستی بـە ( الحمد لله رب العالمين ) ئەكرد ، یەعنی بە فاتیحە ، بێدەنگ نەئەوەستا •

٢٠٧٧/١٢ ـ عن أبي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كنا نحزر قيام رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في الظهر والعصر فحزرنا قيامه في الركعتين الأوليين من الظهر قدر قراءة ( ألم تنزيل ) ، وحزرنا قيامه في الأخريين قدر النصف من ذلك • وحزرنا قيامه في الركعتين الأوليين من العصر على قدر قيامه من الأخريين من الظهر ، وفي الأخريين من العصر على النصف من ذلك • م ـ ٣/١٠١ •

٢٠٧٨/١٣ ـ وعنه أيضاً في رواية أبي بكر أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان يقرأ في صلاة الظهر في الركعتين الأوليين في كل ركعة قدر ثلاثين آية ، وفي الأخريين قدر خمس عشرة آية ، أو قال نصف ذلك ، وفي

العصر في الركعتين الأولیين في كل ركعة قدر قراءة خمس عشـــرة آيـة • وفي الأخريين قدر نصف ذلك • م ـ ١٠١/٣ •

٢٠٧٩/١٤ ـ وعنه أيضاً لقد كانت صـلاة الظهر تقام فيذهب الذاهب إلى البقيع فيقضي حاجته ثم يتوضأ ثم يأتي ورسـول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ في الركعة الأولى = مما يطولها = م ـ ١٠٤/٣ •

تەرجەمە :

ئەبوسـەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : تەخمینی نوێژی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مان ئەکرد کە لـە نیوەڕۆو عەصرا چەندە رائەوەستێ ، تەخمینی راوەستانەکەیمان لە نیوەڕۆدا لە دوو رکاتی ئەوەڵیا ئەکرد لە کوللی رکاتێکا بە قەد قیرائەتی ( ألم )ی سەجدە • لە دوو رکاتی دواییدا تەخمینمان ئەکرد بە قەد نیوەی ئەوە رائەوەسـتا • تەخمینی راوەستانەکەیمان لە دوو رکاتی ئەوەڵی نوێژی عەصرا ئەکرد بـە قەد راوەستانی لە دوو رکاتی ئاخری نیوەڕۆ ، لە دوو رکاتی ئاخری عەصرا بە قەد نیوەی ئەوە •

لە ریوایەتەکەی دوەمیا : لە دوو رکاتی ئەوەڵی نیوەڕۆدا بە قەد سی ئایەت لە دوو رکاتی ئاخریدا بە قەد پانزە ئایەت • یا فەرمووی : بـە قـەد نیوەی ئەوە لە دوو رکاتی ئەوەڵی عەصرا لە کوللی رکاتێکا بـە قەد پانـزە ئایەت • لە دوو رکاتی ئاخریدا بە قەد نیوەی ئەوە • لە ریوایەتی سێیەمیا قامەتی نوێژ ئەکرا یەکێك ئەچوو بۆ بەقیع قەضای حاجەتی ئەکرد دەزنوێژی ئەشتو ئەهاتەوە ، ئێشتا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ هـەر لـە رکاتی ئەوەڵا بوو • ئەوەندەی طوول ئەداێ •

[ والحاصـــــل : دوو رکاتی ئەوەڵی نیوەڕۆ ئەوەندەی دوو رکاتی دوایی ، دوو رکاتی دوایی نیوەڕۆ بە قەد دوو رکاتی ئەوەڵی عەصر ، دوو رکاتی ئەوەڵی عەصر بە قەد دوو ئەوەندەی دوو رکاتی دوایی ] ٠

١٥/٢٠٨٠ ـ عن عمرو بن حريث [ رضي الله تعالى عنه ] سـمع النبي ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ يقـرأ في الفجـر والليـل إذا عسعس ٠ م ـ ٣/١٠٦ ٠

١٦/٢٠٨١ ـ وفي أخرى عنه : فلا أقســم بالخنس الجوار الكنس ، فكان لا يحني رجل منا ظهره حتى يستتم ساجداً ٠ م ـ ٣/١٢٢ ٠

**تەرجەمە :**

عەمری کوڕی حورەیث ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ : لـە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م بیست لە نوێژی سبەینیدا ( والليل إذا عسعس )ی خوێند ٠ ـلە ریوایەتـەکەی ترا ( فلا أقسم بالخنس الجوار الكنس )ی ئەخوێند ، هیچ = کەسێ = لـە ئێمە کـە لـە روکووع هەڵەستایەوە تا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە سوجدەدا قەراری نەگرتایە نەئەچوو بۆ سوجدە ٠

١٧/٢٠٨٢ ـ عن قطبة بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صـليت وصلى بنا رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ فقرأ : ( ق والقرآن المجيد ) حتى قرأ ( والنخل باسقات ) فجعلت أرددها ولا أدري ما قـال ٠ م ـ ٣/١٠٦ ٠

**تەرجەمە :**

قەطبەی کوڕی مالیك [ رضي الله تعالى عنه ] ئەفەرموێ : نوێژم کرد پێغەمـەر ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ نوێـژی پێکردین لە نوێـژا

( ق والقرآن المجيد )ى خوێن تا ( والنخل باسقات )ى خوێند ، من تیکرارم ئەکردەوە ئیتر نازانم چی فەرموو • لە ریوایەتی جابیری کوڕی سەمورەدا ئەفەرموێ : کە لە خذمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی سبەینێی کرد لە ئەوەڵ رکاتا ( والنخل باسـقات لهـا طلع نضـيد )ى خوێند •

لە ریوایەتێکی ترا ( ق )ى خوێند ، لە دوای ئەوە نوێژەکەی خەفیف بوو • لە ریوایەتێکی تریا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ نوێژی وەك نوێژی ئەوانە ئەکرد • م ـ ٣/١٠٧ •

١٨/٢٠٨٣ ـ عن ابن عباس ـ رضـي الله تعـالى عنهما ـ قال : إنطلق النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في طائفة من أصحابه = عامدين = إلى سوق عكاظ ، وقد حيل بين الشياطين وبين خبر السماء ، وأرسـلت عليهم الشهب ، فرجعت الشياطين الى قومهم ، فقالوا : ما لكم ؟ فقالوا : حيل بيننا وبين خبر السماء ، وأرسلت علينا الشهب • قالوا : ما حال بينكم وبين خبر السماء إلا شيء حدث، فاضربوا مشارق الأرض ومغاربها فانظروا ماهذا الذي حال بينكم وبين خبر السماء • فانصرف أولائك الذين توجهوا نحو تهامـة الى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وهو بنخلة عامدين إلى سوق عكاظ وهو يصلي بأصحابه صلاة الفجر • فلما سـمعوا القرآن اسـتمعوا لـه ، فقالوا : هذا والله الذي حال بينكم وبين خبر السماء • فهنالك حين رجعوا إلى قومهم وقالوا : ( يا قومنا إنا سمعنا قرآناً عجبا يهدي الى الرشد فآمنـا به ولن نشرك بربنا أحدا )• فأنزل الله على نبيه ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: ( قـل أوحي إلي ) وإنما أوحي إليـه قـول الجـن • ح ـ ٢/٨٩ • م ـ ٣/٩٣ • ت ، ن •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەگەڵ بەعزێ لە ئەصحابی تەشریفیان چوو بۆ بـازاڕی عوكاظ ، لەو وەختەدا مانیع خرابوە بەینی شـــەیاطینییو بەینی خەبەری ئاســـمانو شەهابیان تێرابوە ســـــەر ، گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان لێیانپرسین : چیتان لێ قەوماوە ؟ وتیان : مەنعکراوین لەوە کـە خەبەری ئاسمان ببیێن • کە چووین گوێبگرین شـــەهابمان بەســـەرا بارێنرا • پێیانوتن : ئەبێ شتێك ظوهووری کردبێ کە حائیل خراوەتە بەینی ئێوەو خەبەری ئاسمانەوە ، بچن مەشـــرقو مەغریبی ئەرز تێکەوە بدەن بزانن ئەوی کە بوە بە حائیل لە بەینی ئێوەو خەبەری ئاسمانا چیە ؟ ئەوانە کـە روویانکردە ئەرزی تەهامە گەڕانەوە رێیان کەوتە خذمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وســلم ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وســلم ـ تـەشـريفی لــە ( نخلـە ) بـوو [ جێـگەیێـکە ] • عـەزمی بـازاڕی عوکـاظی ئەکـرد لـەو وەختـەدا کــە شـــەیـاطینییەکان گەیینە ئەوێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی سبەینێی بە ئەصحابی ئەکرد ، کە قورئانیان بیست گوێیان لێگرت وتیان : وەڵڵاهی ئەمەیە کـە بوە بـە مانیع لە بەینی ئێوەو خەبەری ئاسماناەلەوێ کە گەڕانەوە بۆ لایقەومەکەیان وتیان : ئەی قەومی ئێمە ـ ئێمەگوێمان لە قورئانێکی عەجایەب بوو ! بـۆ رێی چاکە هیدایەتی خەڵق ئـەدا ئیمانمان پێ هێنـا ، لەمەولا بە ئـەبـەدیی هیچکەس ناکەین بە شەریکی خوا • خوا ئەو وەختە ( قل أوحي إلي )ی بۆ پێغەمەری خۆی ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رەوانەکرد • هەر قســـەی جنیەکانی بۆ نارد کە لە بەینی خۆیانا کردبوویان •

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەو وەختــەدا رەنگە لەدایـك نەبووبێ ، كە وابێ ئەم حەدیثە مورسەلی صەحابی‌یە ، حوكمی مەرفووعی هـەیـە •

۱۹/۲۰۸٤ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعـالى عنهما ] قال : قرأ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فيما أمر ، وسكت فيما أمر ، وما كان ربـك نسيا • ولقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة • ح ـ ۸۹/۲ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ: پێغەمەر ـ صلى‌الله تعالى عليه وسلم ـ لەوەدا ـ كە ئەمری پێكرابێ خوێندوویەتی ، لەوەدا كە ئەمری پێكرابێ سكووتی‌كردوە • خوا هیچی لە فكر نەچوەتەوە ، بۆ ئێوەیش لە رەســـــوولوڵلادا ئیقتیداكردنێكی باشتان هەیە ، یەعنی ئەو لـــە كوێدا خوێندوویەتی‌و لە كوێدا نەیخوێندوە ئیقتیدای پێ بكەن ، غەیـری ئــەوە مەكەن •

۲۰/۲۰۸٥ ـ عن عبدالله بن السـائب [ رضـي الله تعـالى عنه ] : قرأ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ( المؤمنون ) في صلاة الصبح حتى إذا جاء ذكر موسى وهارون ، أو ذكر عيسى [ عليهم الصلاة والسلام ] أخذتـه سَعلة فركع • ح ـ ۹۰/۲ • م ـ ۱۰٥/۳ • وعبدالله بن السـائب حاضر ذلك • م ـ ۱۰٦/۳ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵلای كوڕی ســـــائیب ـ رضي الله تعالى عنه ـ خۆی حاضری وەقعەكە بوە ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە نوێژی سبەینێدا ( قد أفلح المؤمنون )ی خوێند تا گەیی‌یە سەر ذیكری مووســاو

هاروون ، یا فەرمووی : گەیی‌یە ذیكری عیسا ـ علیهم الصلاة والسلام ـ كۆكە گرتی‌و چوە روكووع • یەعنی قەطعی قیرائەتەكەی كرد •

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ركاتی ئەوەلآ صـەدوبیست ئایەتی خوێند ، لە ركاتی دوەما سوورەتێكی لە ( مثاني ) خوێنـد ، یەعنی صـەد ، یا كەمتر ، یـا غەیری حەوت سـوورەتە درێژەكان ح ـ ۲/۹۰ • ( وصله ابن أبي شيبة ) •

ئەحنەف ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ركاتی ئەوەلآ ( الكهف )ی ، لـە ركاتی دوەما ( یوســـف )ی یا ( یونس )ی خوێند ، فەرمووی : لەگەڵ ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ نوێژم كرد ئەو ئەو دوو سوورەتەی خوێند • ح ـ ۲/۹۰ • ( وصله أبو نعيم ) •

ئیبنومەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ركاتی ئەوەلآ چل ئایەتی لە ( ئەنفـال ) خوێنـد ، لـە دوەمـا ســـوورەتێ لە موفەصصەلی خوێنـد • ح ـ ۲/۹۰ • موفەصصەل لـە ( قتـال )ەوە ، یـا لـە فەتحەوە ، یـا لـە ( حجرات )ەوە ، یا لە ( ق )ەوە تا ئاخری قورئانە • ـ چوار قەول ـ •

( عبدالرزاق ) قەتادە ئەفەرموێ : كەسێ سوورەتێ لە دوو ركعەتـا بخوێنێ ، یا فەرمووی : سوورەتێ لـە دوو ركاتا تیكرار بكاتەوە [ هیچ زەرەری نیە ] هەمووی ( كتاب الله )یە • ئەم ئاثارانە هەموو ( معلق )ن • ( عبدالرزاق ) •

۲۱/۲۰۸٦ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دخل المسجد فدخل رجل [ خـلاد بن رافـع ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] فصلى ، فسلم على النبي ـ صلى الله تعـالى عليـه وســـلم ـ فـرد = النبي ـ صـــلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ السلام =

فقـــال : ارجـع فصـــل فإنك لـم تصـــل فرجـع يصـــلي كما صلى ، ثم جاء فسلم على النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : ارجع فصـــل فإنك لم تصل ـ ثلاثاً ـ فقال : والذي بعثك بالحق ما أحسنُ غيره فعلمني ، فقال : إذا قمت الى الصلاة فكبر ، ثم اقرأ ما تيسر معـك من القـرآن ، ثم اركع حتى تطمئن راكعا ، ثم ارفع حتى تعتدل قائما ، ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ، ثم ارفع حتى تطمئن جالســـا • وافعل ذلك في صـــلاتك كلها •
ح ـ ٨٢/٢ • م ـ ٢٠/٣ • د ، ت ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی هاتە مزگەوت ، پیاوێ ـ کـە خەلادی کوڕی رافیع بوو ـ رضي الله تعالی عنه ـ هاتە مزگەوت نوێژی‌کرد ، هات سەلامی لە پێغەمەر کرد ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەمری پێ‌فەرموو بچۆ نوێژەکـــەت بکەرەوە چونکی تۆ نوێژت نەکرد ! چوەوە دووبارە وەك جاری پێشوو نوێژەکـــەی کردەوەو هـات سەلامی لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کرد • دووبارە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : بچۆ نوێژ بکە ؛ چونکە نوێژت نەکرد ـ تا سێ جار ـ • عەرزی‌کرد : قەســـــەم بەوەی کە تۆی بـە حەق رەوانەکردوە ! غەیری ئەوە چاتـر نازانم ، فێـرم بکە • فەرمووی : کـە ئیرادەت بوو بۆ نوێژ راوەستی [ دەزنوێژێکی تەواو بشۆ لە پاشـــا روو بکەرە قیبلە • آخری ] ( الله أکبر ) بکە ، لـە پاشا لە قورئان چەنـدت بۆ مومکین ئەبێ بخوێنە ، لە پاشا بچۆرە روکووع تا لە روکووعا تەواو قەرار ئەگری ، لە پاشا لە روکووع هەڵسەرەوە تا بەپێوە تەواو رائەوەســـتی ،

لە پاشا بچۆرە سوجدە تا لە سوجدەدا تەواو قەرار ئەگری ، لە پاشـــا لە سوجدە هەڵسەرەوە تا لە دانیشتنا قەرار ئەگری • لە هەمـوو نوێژەکەتـا وا بکە • ح ـ ٨٢/٢ • م ـ ٢٠/٣ • د ، ت ، جه ، ن •

٢٠٨٧/٢٢ ـ عن أبي قتادة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كـان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقرأ في الركعتين الأولیين من صلاة الظهر بفاتحة الكتاب وسورتين يطوّل في الأولى ويقصر في الثانية ، ويسمع الآية أحيانا • وكان يقرأ في العصر بفاتحة الكتاب وسورتين وكان يطوّل في الأولى ، وكان يطوّل في الأولى من صـــلاة الصــبح ويقصر في الثانية • ح ـ ٨٣/٢ • م ـ ٩٨/٣ • د ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

ئەبوقەتادە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلى الله تعـالى عليــه وسـلم ـ لـە دوو رکـاتی ئەوەڵی نوێژی نیوەڕۆدا فاتیحای ئەخوێن ، دوو ســــوورەتی ئەخوێند ، لە رکاتی ئەوەڵا طوولی پێ ئەدا • لە دوەما کورتی ئەکردەوە ، بەعزێ وەقت ئایەتی وا ئەخوێند کــە خەڵق بیبیێن ، لە عەسرا فاتیحاو دوو سوورەتی ئەخوێند لە رکاتی ئەوەڵا طوولی پێ ئەدا لە رکاتی ئەوەڵی نوێژی سبەینێدا طوولی پێئەدا لە رکاتی دوەمـا کورتی ئەکردەوە •

[ نوێژی شێوانو خەوتنانیش بەم نەوعە ] •

٢٠٨٨/٢٣ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أنه قال : إن أم الفضل [ خالته ـ رضي الله تعالى عنها ـ ] سمعتْه وهو يقرأ ( والمرســلات عرفا ) فقالت : يا بُني والله لقد ذكّرتني بقراءتك هذه السورة أنها لآخـر ما سمعت من رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقرأ بهـا في المغـرب

[ وفي رواية صالح عنه : ثم ما صـلى بعد حتى قبضــــه الله ـ عز وجل ـ ]
ح ـ ٨٤/٢ • م ـ ١٠٨/٣ • د ، جـ •

**تەرجەمە :**

ئوممولفەضلی پووری ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعـالى عنهم ـ گوێی لێ ئەبێ کە سوورەتی ( والمرسلات ) ئەخوێنێ پێی ئەفەرموێ : رۆڵـە بـە خوێندنی ئەم سوورەتەت ئەوەت هێنامەوە فیکر کە ئەمە ئاخری ئەوەیە کە لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م بیست کە لـە نوێژی مەغریبـا ئەیخوێند ، ئیتر نوێژی نەکرد تا خوا ـ عز وجل ـ قەبضی کرد •

٢٠٨٩/٢٤ ـ عن مروان = بن الحكم = [ ••••• ] قـال : قـال لي زيد بن الثابت [ رضي الله تعالى عنه ] : ما لك تقرأ في المغرب بقصار ، وقد سمعت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ يقرأ بطولى الطوليين [ البقرة ونساء ، أو الأعراف ] ح ـ ٨٥/٢ ، د ، ن •

**تەرجەمە :**

مەروان ئەڵێ : زەیدی کوڕی ثابیت ـ رضـــي الله تعالى عنــه ـ پێی فەرمووم : بۆچی لە نوێژی مەغریبا هەر سوورەتە کورتەکـان ئەخوێنی ؟ من لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م بیست کـە درێژترینی دوو سوورەتە درێژەکانی ئەخوێند • کە ( البقرة )و ( نساء ) ، یا ( أعراف )ە •
[ ئەبێ وەختی نوێژی مەغریب واسیع بێ ] •

٢٠٩٠/٢٥ ـ عن جبير بن مطعم [ رضي الله تعالى عنه ] قال : ســمعت رســـــول الله ـ صـــلى الله تعالى عليه وســـلم ـ قرأ في المغرب بالطور •
ح ـ ٨٦/٢ • م ـ ١٠٩/٣ •

**تەرجەمە :**

له مەغریبا ( والطور )ی خوێند[1] •

٢٠٩١/٢٦ ـ براء بن عازب [ رضي الله تعالى عنهما ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان في سفر فقرأ في العشاء في إحدى الركعتين بالتين والزيتون ، [ وما سمعت أحداً أحسن صوتاً منه = أو قراءة = • أخرى ] • ح ـ ٨٧/٢ • م ـ ١٠٩/٣ • ن ، ت ، جه ، د • •

**تەرجەمە :**

بەرای کوڕی عازیب ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ له سەفەرێکا بوو ، له یەکێ لـه دوو رکاتی نوێژی عیشادا ( والتين والزيتون )ی خوێند • له هیچ کەسم نەبیســـــت کە دەنگی له دەنگی موبارەکی ئەو خۆشتر بێ •

٢٠٩٢/٢٧ ـ أبو هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] يقول : في كل صـلاة يقرأ ؛ فما أسمعنا رسـول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ أسمعناكم وما أخفى عنا أخفينا عنكم ، وإن لم تزد على أم القرآن أجزأت ، وإن زدت فهو خير [ فهو أفضل • أخرى ] • ح ـ ٨٨/٢ • م ـ ١٨/٣ •

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : له هەموو نوێژێکا ئەخوێنرێ ، ئـەوی پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وســـلم ـ بە ئێمەی بیستبێ ئێمەیش بە ئێوەی ئەبیستێین ، ئەوەی کە ئەو له ئێمەی ئیخفا کردبێ

---

(١) دانەر ـ خ ـ هەر ئەوەندەی له تەرجەمەکە نووسیبوو ، ئەوەکەی تری : « جوبەیری کوڕی موطعیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لـــە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م بیست ... » •

ئێمەیش لە ئێوەی ئیخفا ئەکەین • [ یەعنی ئەوی ئەو بە جەهری خوێندوە ئێمەیش بە جەهری ئەخوێنین ، ئەوی ئەو بە سـەبرایی خوێندوە ئێمەیش بە ئەسپایی ئەخوێنین ] ئەگەر لەسەر فاتیحا هیچی تری لێ زیـاد نەکـەی دروستە ، ئەگەر لێی زیاد بکەی ئەوە خێرترەو باشترە •

٢٨/٢٠٩٣ ـ عن أنس [ رضي الله تعالى عنه ] كان رجل من الأنصـار [ كلثوم بن هِدْم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] يؤمهم في مسجد قبـاء ، وكان كلما افتتح سورة يقرأ بها لهم في الصلاة مما يقرأ به ، افتتح بقل هو الله أحد حتى يفرغ منها ، ثم يقرأ سورة أخرى معها ، وكان يصنع ذلك في كل ركعة [ الظاهر أي من الأوليين ] فكلمه أصحابه فقالوا : إنك تفتتح بهذه السورة ثم لا ترى أنها تجزئك حتى تقرأ بأخرى ، فإما أن تقرأ بها ، وإما أن تدعهـا وتقرأ بأخرى • فقال : ما أنا بتاركها ، إن أحببتم أن أؤمكم بذلـك فعلت وإن كرهتم تركتكم ، وكانوا يرون أنه من أفضـــلهم ، وكرهوا أن يؤمهم غيره • فلما أتاهم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أخبروه الخبر • فقال : يا فلان ما يمنعك أن تفعل ما يأمرك به أصحابك ؟ وما يحملك على لزوم هذه السورة في كل ركعة ؟ فقال : إني أحبها • فقال : حبك إياها أدخلك الجنة • [ وصله الترمذي والبزار عـن البخـاري ] ح ـ ٩١/٢ ، م ـ ٩٩/٤ ، عـن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ بأخصر •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پیاوێ لە ئەنصـــــــار ـ کولثووم ناوی کوڕی هیدم ـ لە مەسجیدی قوبادا ئیمامەتی بۆ ئەکردن ، وابوو کە سوورەتێکی بۆ بخوێندنایە لە نوێژا لە پێش ئەو ســـوورەتەوە دەستی ئەکرد بە ( قل هو الله أحد ) تا ئاخری ئەیخوێند ، ئەمجا سوورەتێکی

تری لەگەڵ ئەخوێند ، لە هەموو رکاتێکا وای ئەکرد • ئەصـــحابی پێیان فەرموو : تۆ دەست ئەکەی بەم سوورەتە لە پاشا وائابینی کە بۆت دروستە تا پێنی سوورەتێکی تری لەگەڵ ئەخوێنی • یا تەنها هەر ئەو بخوێنە ، یـا ئەو تەرك بکە سوورەتێکی تر بخوێنە • فەرمووی : من ئەوە تەرك ناکەم ، ئەگەر حەزەکەن ئیمامەتیتان بۆ بکەم بەو نەوعە ئەیکەم ، ئەگەر حەز ناکەن تەرکی ئیمامەتیتان ئەکەم ، ئەوانیش وایان ئەزانی کە ئەو ئەفضـــەلیانە حەزیان نەئەکرد کە غەیری ئەو ئیمامەتیان بۆ بکا • کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی چوو بۆ مزگەوتی قوبا لایان عەرزی ئەوەیـان کرد لە خذمەتیا ، فەرمووی : ئەی فلاڵن چی مەنعت ئەکا لەوەی ئەوەی کە برادەرەکانت ئەمرت پێ ئەکەن بیکەی ؟ چی تۆی هێناوەتە سەر ئەوە کە لە هەموو رکاتێکا هەر ئەو سوورەتە دەوامی لەسەر بکەی ؟ عەرزیکرد : من ئەو سوورەتەم خۆشەوێ • فەرمووی : خۆشویستنی ئەو ســـوورەتەت تۆی بردۆتە ناو بەهەشتەوە •

تەماشای فەضلی ( قل هو الله ) بکەن !

لە دوای فاتیحە خوێندنی چەند سوورەتێ ( بلا کراهة ) دروســتە • تیکراری سوورەت دروستە •

٢٩/٢٠٩٤ ـ أبو وائل [ شـــــقیق ] قـال : جـاء رجل یقـال لـه نهیك بن سنان إلى ابن مسعود [ رضي الله تعالى عنه ] فقال : یا أبا عبدالرحمن کیف تقرأ هذا الحرف : ألفا تجده أم یا ؟ : ( من ماء غیر آسن )[1] أو غیر یاسن • قال : فقال عبدالله : وکـل القرآن قد أحصیت غیر هـذا الحرف ؟! قال : إني لأقرأ المفصل في رکعة • فقال عبدالله : هذًّا کهذّ الشـــعر ! إن

---

(١) محمد/١٥ •

أقواماً يقرؤن القرآن لا يجاوز تراقيهم ، ولـكن إذا وقع في القلب فَرَسخَ فيه نفع • إن أفضل الصلاة الركوع والسجود • إني لأعلم النظائر التي كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقرن بينهن سورتين في كل ركعة • ثم قام عبدالله فدخـل علقمة في أثره ثم خـرج قـال : قـد أخبـرني بهـا • ح ـ ٢/٩١[٢] • م ـ ٤/١٠٩ ، ١١٠ •

٣٠/٢٠٩٥ ـ وعنه أيضاً قال : غدونا على عبدالله بن مسعود [ رضـي الله تعالى عنه ] يوماً بعد ما صلينا الغداة ، فسلمنا بالباب ، فأذن لنا ، قـال : فمكثنا بالباب هُنَيَّـة ، قال : فخرجت الجاريـة ، فقـالت : ألا تدخلون ؟ = فدخلنا = فإذا هو جالس يسبِّح ، فقال : ما منعكم أن تدخلوا وقد أذن لكم ؟ فقلنا : لا إلاّ أنّا ظننا أن بعض أهـل البيت نائم • قال : أظننتم بآل ابن أم عبد غفلة ! قال : ثم أقبل يســـبح حتى ظن أن الشمس قد طلعت ، فقال : يا جارية أنظري هل طلعت ؟ قال : فنظرت فإذا هي لم تطلع • فأقبـل يسبح حتى اذا ظن الشمس قد طلعت ، فقال : يا جارية أنظري هل طلعت ؟ فنظرت فإذا هي قد طلعت • فقال : الحمد لله الذي أقالنا يومنـــا هـــذا • فقال مهدي [ أحد الرواة ] وأحسبه قال : ولم يهلكنا بذنوبنا • قال نقـال رجل من القوم : قرأت المفصل البارحة كله • قال : فقـال عبدالله : هـذًّا كهذِّ الشِّـعر ! إنا لقد سمعنا القرائن ، وإني لأحفـظ القرائـن التي كـان يقرأهن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثمانية عشر من المفصـل وسورتين من آل حم • م ـ ٤/١١٢ • ح ـ ٧/٤٦٩ • بأخصر ليس فيـه حديث الجارية •

(٢) ئەم حەدیثەم لەو جێگەدا کە دیاریی کراوە نەدۆزیيەوە .

**تەرجەمە :**

[ هەر حادیثەییکە ، کە وابێ لە تەرجەمەی هەردوکیاندا بەســـــەر یەکەوە بەئس نیە ] •

ئەبو وائیل ـ کـــە شەقیقە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : رۆژێ دوای نوێژی سبەینێ چووینە خذمەت ئیبنو مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە دەرگاوە سەلاممان کرد ، ئیذنـدراین کە بچینە خذمەتی ، قەدرێ لـە بـەر دەرگاکەدا وەستاین • جاریەیێ هاتەدەرێ وتی : بۆ ناچنە ژووری ؟ کـــە چووینە ژووری عەبدوللا ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی دانیشـــــتبوو ویردی ئەخوێند • فەرمووی : کە ئیذنـدران بێنەژووری چی لـەوە مەنعی کردن ؟ عەرزمانکرد : هیچ مەنعی نەکردین ، ئەمما وامان ظەنـبـرد کـــە بەعزێ لە ئەهلی خانە نوستوون • فەرمووی : وا ظەن ئەبەن بە ئالی کوڕی ئومەو مەعبەد کە غافڵ بن ! لە پاشا رووی‌کردەوە سەر ویردەکەی تا ظەنی وا برد کە رۆژ هەڵاتوە ، بـە جاریـەکـەی فەرموو : تێفکرە بزانـە رۆژ هەڵاتوە ؟ چوو تێفکری هاتەوە عەرزی‌کرد : هەڵنـەهاتـوە • دووبـارە دەستی کردەوە بە تەسبیحات تـا وای ظەنبرد کـە رۆژ هـەڵاتـوە ، بـــە جاریەکەی فەرموو : بچۆ تێفکرە رۆژ هەڵاتوە ؟ چوو تێفکری هاتـەوە عەرزی‌کرد : کە هەڵاتوە ، فەرمووی : ( الحمد لله الذي أقالنا يومنا هـــذا ولم يهلكنا بذنوبنا ) : حەمد بۆ ئەو خوایەیە کە ئیمرۆی پێبەخشین ؛ بـە واسیطەی گوناهمانەوە بە هیلاکی نەبردین •

پیاوێکی ، نەهیك ناوی کوڕی ســــینان ، عەرزی‌کرد : ( یـا أبـا عبدالرحمن ) ئەم کەلیمەیـە چۆن ئەخوێنیەوە ؟ بـە هەمزەی ئەخوێنیەوە ئەڵێی ( من ماء غير آسن ) یـا بـە یێی ئەخوێنیەوە ئەڵێی : ( من مـاء غير

یاســـــن ) [ یەعنی ئاوێکی تامو بۆنو رەنگ نەگۆڕراو ] ؟ فەرمووی : غەیری ئەم کەلیمەیە هەموو قورئانت هەڵژماردوە[1] [ئەمکەلیمەیەت تەحقیق نەکردوە ؟! ] ئەو پیاوە عەرزیکرد : ئیمشەو لە رکاتێکا هەموو ( مفصل )م خوێند . فەرمووی : خێراخوێندنەوەیێکە وەك خێراخوێندنەوەی شیعر ! من ئەو نەظائیرانەی کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کە بە یەکەوە ئەیخوێندن هەموویان ئەزانم بیست سوورەتە : هەژدەی لە ( مفصـــــل ) دوانی لە ( آل حم ) ، لە کوللی رکاتێکا دوو ســوورەت ـ دوو سوورەت ئەیخوێندن . لە پاشا عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشـــــریفی چوە ژووری ، عەلقەمە بە شوێنیا چوو ، لە پاشا عەلقەمە هاتەدەرێ فەرمووی : ئەو سوورەتانەی پێ‌فەرمووم کە کامەن :

١ ـ ( الرحمن ) و ( والنجـم ) لـە رکاتێـکا . ٢ ـ ( إقترب ) و ( الحاقة ) لە رکاتێکا . ٣ ـ ( والذاریـات ) و ( والطور ) لـە رکاتێکا . ٤ ـ ( الواقعة ) و ( ن ) لە رکاتێکا . ٥ ـ ( سأل ) و ( والنازعات ) لــە رکاتێکا . ٦ ـ ( ویل للمطففین ) و ( عبس ) لە رکاتێکا . ٧ ـ ( مدثر ) و ( مزمل ) لە رکاتێکا . ٨ ـ ( هـل أتی ) و ( لا أقســـم ) لە رکاتێکا . ٩ ـ ( عمّ ) و ( والمرسلات ) لە رکاتێکا . ١٠ ـ ( إذا الشمس کورت ) و ( دخان ) لە رکاتێکا . ( علی تألیف ابن مسعود ) ـ رضي الله تعالی عنه ـ کە قورئانی تەرتیب‌کردوە .

عطا ئەفـەرمـوێ : ( آمین ) دۆعـایــە . ( وصـــله عبدالرزاق ) ح ـ ٢/٩١ . د ، ن .

---

(1) دانەر ئەم دێرەی هەڵە تەرجەمەکردبوو بــە کەمێك دەســــکاری راستم کردەوە .

أمَّن ابن الزبير [ رضي الله تعالى عنهما ] ومن وراءه حتى إن للمسجد للجَّـةً •

ئیبنوزوبەیرو ئەوی لـە دوای ئەوەوە نوێژیـان ئەکرد [ بە جارێ ] ئامینیان‌کرد حەتا مزگەوتەکە دەنگی دایەوە •

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ بانگی ئیمامی کرد ، کە عەلای حەضرەمیی بوو ، کە ئامینم لە کیس مەدە •

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ ئـامینی تـەرك نـەئـەکەرد ، تەشویقی خەڵقی لەسەر ئەکرد • ئەیفەرموو : لەوە خێرم بیســـتوە ، لـە ریوایەتێکا خەبەرێکم دەرحەق بیســـــتوە • ( وصـــــله عبدالرزاق ) • ح ـ ٢/٩٤ •

قال الإمام غير المغضــوب عليهم ولا الضـــــالين فقولوا : آمين[1] • والباقي هو الباقي • ح ـ ٢/٩٥ •

٢٠٩٦/٣١ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا أمن الإمام فأمِّنوا ؛ فإنه من وافق تأمينه تأمين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه • ح ـ ٢/٩٤ ، ٩٥ • ذكره موصولا في الدعوات • وفيه ( القارىء ) بدل ( الإمام ) • ح ـ ٩/٢١٦ • د ، ت • م ـ ٣/٤٩ •

٢٠٩٧/٣٢ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا قال أحدكم آمين ، وقالت الملائكة في

---

(1) ئەمە بەشێکە لـە حەدیثێك دانەر ـ خ ـ تـەواوی نەکردوە ، ئـەمـە تەواوی‌یەکەیەتی : « عن أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ ان رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : اذا ... فانه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه » . تەرجەمەکەیشی وەك تەرجەمەی ئەو دوو حەدیثە وایە کە لە دوایەوە دێن .

السماء آمين ، فوافقت إحداهما الأخرى غفر = لـه = ما تقدم من ذنبـه •
ح - ٩٥/٢ • م - ٤٩/٣ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کـە ئیمام ئامینی کرد ئێوەیش [ لەگەڵ ئەوا ] ئامین بکەن ؛ چونکی یەکێ لـە ئێـوە وتی ئامین مەلائیکەیش لە ئاسمانا وتی ئامین ، ئامینی هەرکەسێ لەگەڵ ئامینی مەلائیکە یەکدیگیر ببێ ئـەو گوناهـەی لـەوە پێش کردوویەتی خوا لێی خۆش ئەبێ •

٢٠٩٨/٣٣ ـ عمران بن حُصـــين [ رضي الله تعـالى عنـه ] ، وكـان مبسورا ، = وقال أبو معمر مرة عن عمران = قال : سألت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن صـلاة الرجل قاعـدا ، فقال : إن صلى قائماً فهو أفضل ، ومن صلى قاعداً فله نصف أجر القائم ، ومن صلى نائماً فله نصف أجر القاعد • خ ـ ٢٩٢/٢ • د ، ت ، ن ، جه •

٢٠٩٩/٣٤ ـ وعنه قال : كانت بي بواسير ، فسألت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن الصلاة ، فقال : صل قائما ، فإن لم تستطع فقاعدا ، فإن لم تستطع فعلى = جنب = خ ـ ٢٩٢/٢ •

**تەرجەمە :**

عیمرانی کوڕی حوصـــەین ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ : باسوورم بوو ، لە پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پرسی : کە چۆن نوێژ بکەم ؟ بە دانیشتنەوە بۆم دروستە یـان نا ؟ فەرمووی : فەرمووی : بە پێیانەوە بیکە ، ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتنەوە بیکە ، ئەگەر نەتتوانی بەسەر تەنیشتەوە • بە پێیانەوە کردنی ئەفضەلە • کەسێ بە دانیشـــتنەوە

نوێژ بکا نیوەی ئەجری ئەوەی هەیە کە بە پێیانەوە بیکا ، بە راکشانەوە نوێژ بکا نیوەی ئەجری ئەوەی هەیە کە بە دانیشتنەوە ئەیکا •

٣٥/٢١٠٠ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال : من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن فهي خداج ـ ثلاثاً ـ غير تمام • فقيل لأبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : إنا نكون وراء الإمام ! فقال : إقرأ بها في نفسك [ أي سراً ] فإني سمعت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : قال الله ـ عز وجل ـ : قسمتُ الصلاة بيني وبين عبدي نصفين ، ولعبدي ما سأل : فإذا قال العبد : ( الحمد لله رب العالمين ) قال الله ـ عز وجل ـ : حمدني عبدي • وإذا قال : ( الرحمن الرحيم ) قال الله ـ عز وجل ـ أثنى عليَّ عبدي • وإذا قال : ( مالك يوم الدين ) قال : مجّدني عبدي • وقال مرة : فوّض إلي عبدي • فإذا قال : ( إياك نعبد وإياك نستعين ) قال : هذا بيني وبين عبدي ، ولعبدي ما سأل • فإذا قال : (إهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين ) قال : هذا لعبدي ولعبدي ما سأل[1] • وفي آخر أخرى : فنصفها لي ونصفها لعبدي •

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : هەرکەسێ نوێژ بکاو فاتیحەی تیا نەخوێنێ ئەو نوێژەی ناتەواوە • ( سێ دەفعە وای فەرموو ) عەرزی ئەبوهورەیرەیانکرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ئێمە لە پشت ئیمامەوە ئەبین ! فەرمووی : لە دڵی خۆتانا بیخوێنن ، یەعنی بە

(١) دانەر ـ خ ـ شوێنی ئەم حەدیثەی دیاری نەکردوە •

دزی‌یەوە ؛ چونکە من لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ م بیست.
ئەیفەرموو : خوا ـ عز وجل ـ فەرمووی : نوێژم لە بەینی خۆم‌و عەبدما
بە دوو بەشی راست بەش‌کردوە • بۆ عەبدی من ئەوەیە کە ویستوویەتی •
کە عەبدی وتی : ( الحمد لله رب العالمين ) : هەرچی جینسی حەمد هەیە کێ
بیکاو بۆ کێی بکا هەمووی بۆ خوایێکە کە پەروەردگاری هەموو عالەمە •
خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : عەبدی من حەمدی بۆ کـردم • کـە وتی :
( الرحمن الرحيم ) : خوایێکە لە دنیـادا مەرحەمەت بـە هەموو رۆح‌لەبەر
ئەکا ، لە ئاخیرەتا بە موسوڵمانان • خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : عەبدی
من ثەنای بۆ کردم • کە وتی : ( مالك يوم الدين ) : مالیك‌و پاشای رۆژی
جەزایـە • خوا ـ عزوجـل ئەفەرمـوێ : عـەبـدی من تەعظیمی کـردم •
دەفعەیێك ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : خوا ئەفەرموێ:
عەبدی من هەموو ئیشی خۆیی بە من سپارد کە وتی : ( إياك نعبد وإيـاك
نستعين ) : هەر بۆ تۆ عیبادەت ئەکەین‌و لە هەموو ئیشێکمانا هەر لـە تـۆ
یاری‌یە طەڵەب ئەکەین • خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : ئەمە موشتەرەکە
لە بەینی من‌و عەبدما ، ئەوی لێی ویستووم بۆ ئەو بێ • یەعنی عیبادەتەکەی
مەخصووصە بە منەوە ، طەڵەبی یاری‌یەدان بۆ ئەوە مەطلووبەکەی بۆ ئەو
یاری‌یەی ئەدەم • کە وتی : ( إهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت
عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين ) : هیدایەتمان بۆ رێی راست بدە •
ئەو رێ راستەی کە رێی ئەوانەیە نیعمەتت پێ عەطا فەرموون ، ئەوانە غەیری
ئەوانەن کە غەضەبیان بەسەرا باریوەو غەیری ئەوانەن کـە لـە رێی حەق
لایان‌داوەو ونیان‌کردوە ، خوا ئەفەرموێ : ئەمە هی عەبدی منـە ، ئەوی
ویستوویەتی بۆ ئەو بێ • کـــە وابێ نیوەی نوێژەکەی بۆ منـەو نیوەی
نوێژەکەی بۆ عەبدی منە •

ئەبوهورەیرە ـ رضـي الله تعـالى عنـــه ـ بـــەم حەدیثی قودسی‌یە ئیستیدلال لەسەر ئەوە ئەکا کە لـە نوێژا فاتیحە خوێندن لازمە ؛ چونکی نوێژی بەش‌کردوە لە بەینی خۆی‌و عەبدیـا • وەختێ ئەم تەقسیمە بەجێ یێ کە فاتیحای تیا بخوێنرێ •

٢١٠١/٣٦ ـ عن عمران بن الحصين [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صلى بنا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلاة الظهر أو العصر ، فقال : أيكم قرأ خلفي بسبح اسم ربك الأعلى ؟ فقـال رجـل : أنا ولم أرد بها إلا الخير • قال : قد علمت أن بعضكم خالجنيها • وفي أخرى : الظهر [ من غير شك ] فلما انصرف قال ••• م ـ ٣/٢٤ •

٢١٠٢/٣٧ ـ عن أنس [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صليت مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وأبي بكر وعمر وعثمان ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فلم أسمع أحداً منهم يقرأ بسم الله الرحمن الرحيم • م ـ ٣/٢٦ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لـە خـزمـەت پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ و ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانا ـ رضي الله تعـالى عنهم ـ نوێـژم کردوە لە هیچیانم نەبیستوە کـە ( بسـم الله الرحمن الرحيم )ی خوێندبێ[1] •

(١) دانەر ـ خ ـ تەرجەمـەی حەدیثی ( ٢١٠١/٣٦ )ی لەبیرچوە ئـەمـە تەرجەمەکەیەتی : « عیمرانی کوڕی حوصـــەین ـ خ ـ ئـەفـەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی نیوەڕۆ یا عەصـــری بۆ کردین ـ دوایی ـ فەرمووی : کامتان لە پشتی منەوە ( سبح اسم ربك الاعلى )ی خوێند ؟ پیاوێك وتی : من ، بەڵام چاکە نەبێ هیچی ترم ←

ئەم حەدیثە دەلیلی حەنەفی‌یە کە ئەڵێن : ( بسم الله الرحمن الرحيم ) لە فاتیحە نیە • کـەچی خوێندنی لـە لایـان واجبـە ئـەمما بـەدزی‌یـەوە ئەیخوێندن • لازم ناکا کە ئەنەس نەیبیستبێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەیخوێندبێ •

٢١٠٣/٣٨ ـ عن سبرة أن عمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] كان يجهر بهؤلاء الكلمات ، يقول : سبحانك أللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ، ولا إله غيرك • وعن قتادة أنه كتب إليه يخبره عن أنس بن مالك أنه حدثه ، قال : صليت خلف النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ وأبي بكر وعمر وعثمان ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فكانوا يســتفتحون بالحمد لله رب العـالمين • لا يذكرون ( بســـم الله الرحمن الرحيم ) في أول قراءة ولا في آخرها • م ـ ٣/٢٦ •

**تەرجەمە :**

( سبره ) ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە نوێژا ئەم کەلیمانەی بە ئاشکارا ئەخوێند ( سبحانك اللهم ) : ئەی خوایە من تەنزیهی تۆ ئەکەم لە نەقائیص (وبحمدك): حەمدی تۆ ئەکەم• ( وتبارك اسمك ) : ناوی تۆ چونکی دەلالەت لە زاتی پاکی ئەقدەســت ئەکا موبارەك‌و گەورەیە • ( وتعالى جدك ) : قودرەت‌و شەوکەتی تۆ زۆر بەرزو بڵندە ، لە قووەت‌و شەوکەتی هەموو مەخلووقات بەرەوژووورترە • ( ولا إله غيرك ) : غەیری تۆ هیچ مەعبوودی بە حەق نیە •

---

مەبەست نەبوە . پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ فەرمووی : زانیم کە هەندێکتان لەگەڵما ئەیخوێند » . لە ریوایەتەکەی تردا گومانی ئەوەی تیـا نیـە نوێژەکە عەسر بووبێ ، ئەڵێ : نوێژی نیوەڕۆی بـۆ کردین •

ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەبەری داوە بە قەتادە فەرموویەتی کـە لـە پشــــت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانەوە ـ رضـي الله تعـالى عنهم ـ نـوێـژم کردوە هەموویان [ کە نوێژیان دابەستوە ] دەستیان بە ( الحمد لله رب العالمين ) کردوە ( بسم الله الرحمن الرحيم )یـان ذیکر نەکردوە نــە لــە ئـەوەڵی قیرائەتەوە نە لە ئاخریەوە •

ئەم حەدیثەیش هەر عەینی حەدیثەکەی ئەوەڵە ، نیهایەت لە ئەوەڵەوە دوعای ( إستفتاح )ی لێ زیادکردوە ، ئەوی تری فەرقێکی لەفظیی هەیـە لەگەڵ حەدیثەکەی پێشوودا •

٣٩/٢١٠٤ ـ جابر بن عبدالله الأنصـــاري [ رضي الله تعـالى عنهما ] قال : أقبل رجل بناضحين ، وقد جنح الليل ، فوافق معاذا ـ رضي الله تعالى عنه ـ يصلي ، فترك ناضحه وأقبل إلى معاذ ، فقرأ بسورة البقرة أو النساء • فانطلق الرجل [ بأن سلم وصلى وحده وسلم ] • [ فأخبر معاذ عنه ، فقال : إنه منافق • م ] وبلغه أن معاذاً نال منه ، فأتى النبي ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ فشكا إليه معاذاً • فقال النبي ـ صـلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ : يا معاذ أفتّان أنت ؟! أو أفاتن ؟! ثلاث مرار • فلولا صليت بسبح اســم ربك الأعلى ، والشمس وضحاها ، والليل إذا يغشى ! فإنه يصـــلي وراءك الكبير والضعيف وذو الحاجة • ح ـ ٢/٥١ ، ٥٣ • وفيه : كان معاذ بن جبل ـ رضي الله تعالى عنه ـ يصلي مع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثم يرجع فيؤم قومه • فصلى العشـاء • بمثل الأول • م ـ ٣/١١٠ ، ١١١ وفيه ( إقرأ ) أيضاً •

**تەرجەمە :**

جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ ـ رضـــي الله تعـــالی عنهما ـ ئەفەرموێ : مەعاذی کوڕی جەبەل ـ رضـــي الله تعالی عنـــه ـ لە خزمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نوێژی ئەکرد ، لە پاشا ئەگەڕایەوە ئیمامەتی بۆ قەومەکەی ئەکرد ، پیاوێ هات [ کە خەرمی = کوڕی = ئوبەیی کوڕی کەعبە ـ رضـــي الله تعالی عنهما ـ ] دوو وشتری کە ئاوی باغی پێ هەڵەکێشا پێبوو ، شەو داهاتبوو ، تەصادوفی ئەوەی کرد کە مەعاذ ـ رضي الله تعالی عنه ـ نوێژی بە قەومەکەی ئەکرد ، وشترەکەی بەردا ، چوو بۆ لای مەعاذ کە نوێژی عیشای لەگەڵ بکا • مەعاذ [ لە دوای فاتیحە ] ســــوورەتی ( البقرة ) یا ( نساء )ی دەست پێکرد • خەرم بە جوێ نوێژەکەی خۆیی کردو لێیداو رۆیی ، خەبەریان دا بـــە مەعاذ ـ رضـــي الله تعـالی عنه ـ فەرمووی : ئەوە مونافیقە •

کـــە ئـەو قســـەی مەعـاذە بـە خـەرم گــەییــەوە چـــوە خزمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ شکاتی لە مەعاذ کرد لـــە خزمەتیا • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسـلم ـ بە مەعاذی فەرموو : ئەی مەعاذ تۆ بۆ فیتنە بەرپاکەریی ؟ تا ســـێ جار تیکراری فەرمووەوە • بۆچی بە ( سبح اسم ربك الأعلی ) و ( والشمس وضحاها ) و ( واللیـل إذا یغشی ) و ( إقرأ باسم ربك الأعلی ) نوێژت پێنەکردن ؟! چونکی لە پشت تۆوە پیر ، ضەعیف ، صاحیبی ئیش‌و فرمان نوێژ ئەکا •

٤٠/٢١٠٥ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا صلى أحدكم للناس فليخفف ، فإن فيهم الضعيف والسقيم والكبير ، وإذا صلى أحدكم لنفسه فليطول ما شاء •

ح ـ ٢/٥٥ • م ـ ٣/١١٤ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرموویەتی : کە یەکێ لـــە ئێوە نوێژی بۆ خەڵق کرد بە سووکەوە نوێژیان بۆ بکا ؛ چونکی ضەعیفیان تیایە ، نەخۆشیان تیایە ، پیریان تیایە ••• کە بۆ خـۆی نوێژی کرد بـە هەوەسی خۆی طوولی پێ بدا •

٢١٠٦/٤١ ـ حدث عثمان بن العاص الثقفي [ رضي الله تعالى عنـه ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال له : أم قومـك • قال : قلت : يا رسول الله إني أجد في نفسي شيئا • قال : أدنه • فجلّســـني بين يديه ، ثم وضع كفه في صدري بين ثدييّ ، ثم قال : تحول ، فوضعها في ظهري بين كتفي • ثم قال : أم قومك ، فمن أم قوماً فليخفف ، فإن فيهم الكبير ، وإن فيهم المريض ، وإن فيهم الضعيف ، وإن فيهم ذا الحاجة ••• فـإذا صـــلى أحدكم وحده فليصل كيف شاء • م ـ ٣/١١٤ •

**تەرجەمە :**

عوثمانی کوڕی عاصی ثەقەفي ـ رضـــي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەمری پێفەرمووم ؛ فەرمووی : ئیمامەتی بـۆ قەومەکەت بـــکە • عەرزمکرد : ( یا رســـول الله ) بەدڵما وەســـوەســـەو خەیاڵات یێ • فەرمووی : نزیك بەرەوە • لە بەردەمیەوە داینیشانم ، لە بەینی هەردوو مەمکما دەستی موبارەکی نایە سەر سنگم ، لە پاشا فەرمووی : وەرگەڕێ ، دەستی موبارەکی لە بەینی هەردوو شانما لەسەر پشتم دانا ، لە پاشـــا فەرمووی : ئیمامەتی بۆ قەومەکەت بکە • هەرکەسێ ئیمامەتی بۆ قەومێ بکا بەسووکەوە نوێژیان بۆ بکا ؛ چونکی :

پیریان تیایە ، ضەعیفیان تیایە ، نەخۆشیان تیایە ، صاحیب فرمانیان تیایە ...
بە تەنها نوێژ بکا چۆنی هەوەس پێیێ نوێژ بکا .

٤٢/٢١٠٧ ـ أخبر أبو مسعود [ رضي الله تعالى عنه ] أن رجلاً [ غير خرم ـ رضي لله تعالى عنه ـ ] قال : والله يا رسول الله إني لأتأخر عن صلاة الغداء [ لا أكاد أدرك الصلاة . أخرى ] من أجل فلان مما يطيل بنا ! فما رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أشـد غضباً منه يومئـذ ! ثم قال : إن منكم منفّرين ، فأيكم ما صلى بالناس فليتجوز ؛ فإن فيهم : الضعيف ، والكبير ، وذا الحاجة . ح ـ ٥٤/٢ . ح ـ ١٨٥/١ .

**تەرجەمە :**

ئەبومەســعودی ئەنصاریی ـ رضي الله تعــالى عنه ـ هاتە خذمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعاله عليه وسلم ـ عەرزیکرد : ( يا رسول الله )لەبەر ئەوەی کە فلانەکەس زۆر طوول بە نوێژی ئەدا لە نوێژی ســبەینان دوا ئەکەوم [ یەعنی ناتوانم کە بە جەماعەت بیکەم ] ئەبومەسعوود ـ رضي الله نعالى عنه ـ ئەفەرموێ : قەت پێغەمەرم ـ صـلى الله تعـا عليـه وسـلم ـ نەدیبو ئەوەندە غەضەبی هەڵبسێ وەك ئەو رۆژە هەڵسابو . فەرمووی : بەعزێ لـە ئێوە نەفرەت بـە خەڵق ئەکەن [ لـە جەماعەتو ســائیرە ] هەرکەسێ نوێژ بە خەڵق بکا بە کورتی نوێژیان پێ بکا ، چونکی : پیرو ، ضەعیفو ، صاحیب ئیشو فرمانیان تیایە .

٤٣/٢١٠٨ ـ عن جابر [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كان معاذ [ رضي الله تعالى عنه ] يصلي مع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ، ثم يأتي فيؤم قومه . فصلى ليلة مع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ العشاء ، ثم أتى قومه فأمّهم ، فافتتح بسورة البقرة ، فانحرف رجل [ خرم ـ رضي الله تعالى

عنه ـ ] فسلم ثم صلى وحده وانصرف • فقالوا له : أنافقتَ = يا فلان = ؟
قال : لا ، والله لآتينّ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فلأخبرنّه !
فأتى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : يا رســـول الله إنـا
أصحاب نواضح نعمل بالنهار ، وإن معاذاً صلى معك العشاء ، ثم أتى فافتتح
بسورة البقرة • فأقبل رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ على مُعـاذ
فقال : يا معاذ أفتّان أنت ؟! إقرأ بكذا واقرأ بكذا • م ـ ٣/١١٠ •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : موعاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ
لە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـدا نوێژی ئەکرد ، لە پاشا
ئەگەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی ئیمامەتی بۆ ئەکردن • شەوێ لە خزمەت
پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی خەوتنانی کرد • لە پاشـــا
چوەوە بۆ لای قەومەکەی ئیمامەتی بۆ کردن • [ لە دوای فاتیحە ] دەستی
بە ( البقرة ) کرد • پیاوێ [ خەرم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] لە نوێژەکەی
سەلامی دایەوەو ، بـە تەنهـا نوێژی کردو گەڕایـەوە • پێیانوت : بـۆ
= فلانەکەس = بووی بە مونافیق ؟ [ یەعنی خەبەریان دا بە موعاذ کـە
وای کردوە ، موعاذ دەرحەقی ئەو فەرمووی مونافیقە ، ئەم قسەیان بــۆ
خەرم گێڕایەوە ] فەرمووی : خەیر • وەڵلاهی شەرت بێ بچمە خزمەت
پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خەبەری بدەمێ ! هـــاتە خزمەت
پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزیکرد : ( یا رسول الله ) ئێمە
صاحیبی چەردین بە ڕۆژ ئیش ئەکەین ، بە وشتر ئاو لە بیر هەڵئەهێنجین ،
موعاذ لە خزمەت تۆدا نوێژی خەوتنانی کرد ، لە دواییا هات دەستی کرد
بە سوورەی بەقەرە [ یعني إلى آخر ماجرى ] پێغەمەر ـ صـلى الله تعـالى

علیه وسلم ـ رووی‌کردە موعاذ سێ دەفعە پێی فەرموو : یا موعاذ بۆ تـــۆ فیتنەبەرپاکەری ؟! ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتە بخوێنە •

[ ئەمە لەم حادیثەدا چەند حەدیث ، چەندیشم لێ نەنووسی ]

٢١٠٩/٤٤ ـ عن أنس [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كان رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوجز الصلاة ويُكمّلها ح ـ ٢/٥٦ • جه •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وســـــلم ـ بە کورتی نوێژی ئەکردو تەواوی ئەکرد • [ یەعنی ئەرکانی‌و ئادابی بە تەواوەتی بەجێ ئەهێنا ] •

٢١١٠/٤٥ ـ عن أبي قتادة [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إني لأقوم في الصلاة أريد أن أطوّل فأسمع بكاء الصبي فأتجوز في صلاتي كراهية أن أشق على أمه ـ مما أعلم من شدة وجد أمه ، من بكائه أخرى • ح ـ ٢/٥٧ • م ـ ٣/١١١ • د ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ فەرموویەتی : لە نوێـــژا ئەوەستم تەمام وایە کە طوولی پێ بدەم گوێم لە گریانی مناڵ ئەبێ نوێژەکە بە موختەصەری ئەکەم ؛ چونکی حـەز ناکەم دایکی بخەمە زەحمەتەوە ، ئەزانم لە گریانەکەی بۆی ئەکەوێتە حوزن‌و غەمەوە •

٢١١١/٤٦ ـ عن عمرو بن ميمون ـ رضي الله تعـالى عنه ـ أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بعث معاذاً إلى اليمن ، فقرأ معاذ [ رضي الله تعالى عنه ] في صلاة الصبح سورة النساء ، فلما قال : ﴿ واتخذ الله إبراهيم

خليلا )[1] قال رجل خلفه : قَرَّت عين أم إبراهيم [ عليه الصلاة والسلام ]•
ح - ٦/٤٠٥ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ موعاذی نارد بۆ یەمەن ، موعاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە نوێژی سبەینێدا سوورەتی نیســـای خوێند ، کە گەیی‌یە ئایەتی : ( واتخذ الله إبراهيم خليلا ) : خوا ئیبراهیمی گرتوە بە خەلیلی خۆی ـ پیاوێ لە پشت موعاذەوە وتی : چاوی دایـــکی ئیبراهیم ـ عليه الصلاة والسلام ـ روون بوەتەوە •

٢١١٢/٤٧ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قـال : بينما نحن نصلي مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذ قال رجل من القوم : الله أكبر كبيرا ، والحمد لله كثيرا ، وسبحان الله بكرة وأصيلا • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : من القائل كلمة كذا وكذا ؟ قال رجل : أنا يا رسول الله • قال : عجبت لها ! فتحت لها أبواب السماء • قال ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] : فما تركتهن منذ سمعت رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول ذلك • م ـ ٣/٢٨٩ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لـە وەختێــكا لـە خذمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ نوێژمان ئەكرد ، پیـــاوێ لـــە قـەوم وتی : ( الله أكبر كبيرا ) : خـوا بـەگـەورەیی لـــە هەمـوو كـەس گـەورەتـرە ( والحمـد لله كثيرا ) : حەمدی زۆر

(١) النســـاء/١٢٥ •

بـۆ خــوا بێ ـ عـز وجـل ـ ( وســـبحان الله بكـرة وأصـــيلا ) بەیانیو ئێواریێ تەنزیهـو تەقدیس بۆ خوا ئەکەم • پێغەمەر ـ صـــلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : کێ ئەو کەلیمەو ئەو کەلیمەی وت • پیاوێ لە جەماعەت وتی : من ( یارسول الله ) • فەرمووی : عەجایەبم لێ ما ! هەموو دەرگای ئاسمانی بۆ کرایەوە • ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ فەرمووی : لەو وەختەوە کە ئەوەم لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بیست کە فەرمووی هیچ تەرکم نەکردوە •

## قیامو قیرائەتو روکووعو سوجوود

٢١١٣/١ - عن أنس بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] أن رجلاً جاء فدخل الصف ، وقد حفزه النَّفَس ، فقال : الحمد لله حمداً كثيراً طيباً مباركا فيه . فلما قضى رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - صلاته قال : أيكم المتكلم بالكلمات ؟ فأرمّ القوم . فقال أيكم المتكلم بها ؟ فإنه لم يقل بأسا . فقال رجل : جئت وقد حفزني النَّفَس فقلتها . فقال : لقد رأيت إثني عشر ملكاً يبتدرونها أيهم يرفعها . م - ٣/٢٨٩ .

**تەرجەمە :**

ئەنەسی کوڕی مالیك ئەفەرموێ : پیاوێ هات داخڵی صەف بوو ، نەفەسی تەنگ بووبوو ، فەرمووی : ( الحمد لله حمدا كثيرا ) : حەمدێکی زۆر بۆ خوا ئەکەم ( طيبا ) : لە شوبهەی ریيا دوورو پاك بێ . ( مباركافيه ) : خوا بەرەکەتی تێ بخا . کە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی : کێ بوو ئەم کەلیمانەی وت ؟ جەماعەتەکە بێدەنگ بوون . فەرمووی : کێ بوو ئەم کەلیمانەی وت ؟ شتێکی خراپی نەوتوە . پیاوێ وتی : هاتم تەنگەنەفەس بووبووم ، وتم . پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : چاوم‌کەوت بە دوانزە مەلائیکە دەست‌پێشکەری‌یان لە یەك ئەکرد کە کامیان صوعوودی پێ بکا بۆ بارەگای خوا - عزوجل - .

١/٢١١٣[1] ـ عن علي بن أبي طالب [ رضي الله تعالى عنه ] عـــن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه كان إذا قام إلى الصلاة ) : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كە تەشریفی بۆ نوێژ هەڵبستایە ( قال ) : ئەیفەرموو : ( وجهت وجهـي ) : رووم كردۆتە ( للذي فطر السماوات والأرض ) : ئەو ذاتەی كـــە خەلقی هەموو ئاسمانو ئەرزی كردوە ( حنيفا ) : لە هـەموو مەعبوودی باطیل رووم وەرگێڕاوە ( وما أنا من المشركين ) : لە زومرەی موشریكان نیم ( إن صلاتي ) : بـــە تەحقیق نوێژی من ( ونسكي ) : عیبادەتی من ( ومحياى ومماتي )ژیانو مردنی من ( لله ) : هەر بۆ خوایە كە ( رب العالمين ) : پەروەردگاری هەموو عالەمە ( لاشريك له ) : هیچ شەریكی نیە ( وبذلك أمرت ) : بەوانە كە وتم ئەمرم پێكراوە • ( وأنا من المسلمين ) : من لە موسوڵمانانم كە خۆیان تەسلیمی ئەمری ئیلاهیی كردوە •

( اللهم أنت الملك ) : خوایە پادشاه هەر تۆی • ( لا إله إلا أنت ) : غەیـری تۆ مەعبوودی بـەحەق نیـە • ( أنت ربي ) : تـۆ پەروەردگاری منیو ( وأنـا عبـدك ) : من عـەبـدی تـۆم ( ظلمت نفســي ) : ظوڵمم لــە نەفسی خـۆم كـردوە كـــە ئیطاعەی موشـــتەهیاتی ئەكەم [ یەعنی دەستەجڵەوم لێ بەرداوە ] ( واعترفت بذنبي ) : ئیقرار بە گوناهی خۆم ئەكەم • ( فاغفرلي ذنوبي جميعا ) : لە هەموو گوناهم خۆش ببە ( إنه ) : بە تەحقیق ( لايغفر الذنوب إلا أنت ) : غەیری تۆ كەس لە گوناه خۆش نابێ • ( واهدني ) : هیدایەتم بدە ( لأحسن الأخلاق ) : بۆ چاكترینی

---

(١) دانەر ئەم ژمارەی دووپات كردۆتەوە .

هەموو خولقێ ، ( لايهدي لأحسنها إلا أنت ) : غەیری تـۆ هیچ کـــەس هیدایەتی هیچ کەس نادا بۆ چاکترینی ئەخلاق • ( واصرف عني سـيئها ) خولقی خـــراپ لـە مـن وەربگێڕە • ( لا يصـــــرف عني سـيئها إلا أنت ) : غەیری تۆ هیچ کەس خولقی خـــراپ له من وەرناگێڕێ • ( لبيك وســـعديك ) : بـە ذەلیلیی لـە خزمەتو حوضووری تـۆدام • ( والخير كله في يديك ) : هەموو خێر لـە دەستی تۆدایە ( والشر ليس إليك ) [ كقوله ـ عز وجل ( ما أصابك من حسنة فمن الله • وما أصابك من سيئة فمن نفسك )[1] الآية ] شـەڕ راجع بـە تـۆ نیە کەسبی عەمـەلی خۆمە • ( أنـا ) : من ( بك ) : هەر بە قودرەتی تـۆ هاتوومە وجوود • ( وإليك ) : روجووع ئەبمەوە لای تۆ •

( تباركت وتعاليت ) : موبارەكو بڵندی لە هەموو صیفاتی کەمالاتا • ( أستغفرك ) : طەلەبی مەغفیرەت لە تۆ ئەکەم • ( وأتوب إليك ) : لە گوناهکردن روجووع ئەبمەوە لای تۆ •

( وإذا ركع ) : کە روکووعی ئەبرد ( قال ) : ئەیفەرموو : ( اللهم لك ركعت ) : خوایا هەر بۆ تۆ روکووع ئەبەم • ( وبك آمنت ) : هەر ئیمانم بە ئولووهیەتی تۆیەو بەوەی کە ئەمرت پێکردوە کە ئیمانم پێی بێ • ( ولك أسلمت ) : هەر بۆ تۆ ئینیقیاد ئەکەمو تەسلیم ئەبم • ( خشع لك سمعي وبصري ومخي وعظمي وعصبي ) : گوێمو ، چاومو ، مێشکمو ، ئێسکمو ، رەگم ترسو خوشووعیان هەر بۆ تۆیە • ( وإذا رفع ) : کـە

(١) واتە : هەر چاکەیەکت بۆ بێتو دەستت بکەوێت لە لایەنی خوداوەیە ، وە هـەر خراپەیەکت تووش ببێت لـە خۆتەوەیەو خەتـای خۆتـە . النساء/٧٩ •

سەری لە روکووع بەرزئەکردەوە ( قال ) : ئەیفەرموو : ( أللهم ربنـا ولك الحمد . أخری ) : ئەی خوایـە ئەی پەروەردگاری ئێمە حەمـد هەر بۆ تۆیە . ( ملء السماوات ، وملء الأرض ، وملء مابینهما ، وملء ماشئت من شیيء بعد ) : مەعنای لە روکووعایە[1] ( وإذا سجد ) : کـــــە سوجدەی ئەبرد ( قال : اللهم لك سجدت ) : ئەیفەرموو : خوایە هەر بۆ تۆ سوجدە ئەبەم . ( وبك آمنت ) : ئیمانم هەر بە تۆیە . ( ولـــــك أسلمت ) : هەر بۆ تۆ تەسلیم ئەبم . ( سجد وجهي ) : رووی ذیللەتم سوجدە ئەبا ( للذي خلقه ) : بۆ ئەو ذاتەی کە خەلقی کردوە (وصوره ): تەصویری کردوە . [ فأحسن صوره . أخری ] : صـــــوورەتی جوان کردوە . ( وشق سمعه وبصره ) : گوێو چاوی لە کاسەی سەریا شەق کردوە ( تبارك الله ) : موبارەکە خوا کە ( أحســـــن الخالقین ) صنعەت جوانترینی ئەوانەیە کە بە تەعلیمو ئیرادەی ئەو شت دروست ئەکەن .

( ثم یکون من آخر مایقول بین التشهد والتسلیم ) : لە پاشـــا ئاخری ئەوی کە لە بەینی تەشەهودو تەسلیما[2] ئەیفەرموو ئەم دۆعایە بوو ( أللهم اغفر لي ما قدمت ومـــا أخرت ) : خوایا لەوەی کە کردوومەو ، لەوەی کە موقەددەرت کردوە کە لەمەولا بیکەمو ، ( وما أسررت ومـــا أعلنت ) : لەوەی بە دزییەوەو لەوەی بە ئاشکرا کردوومە ( وما أسرفت ) : لـەوەی کـــە ئیسرافم تیـاکردوەو لـــە شـــــــوورم کردۆتـە دەرێو

(۱) دانەر ـ خ ماناى ئەم برگەی نەکردوەو ئەفەرمویٚ : ( لە روکووعایـە ) بەلام نیە . ئەمە ماناکەیەتی : « پڕ بە ئاسمان ، پڕ بە زەوی ، پڕ بـە نێوانیان ، پڕ بە هەر شتێك خۆت خواستت بیێ دوای ئەمانە » .

(۲) دانەر ـ خ ـ مانای ئەم حەدیثەی نەکرد ؛ چونکە هەر ئەو وتانەیە کـە لە حەدیثی پێشوودا یەکە یەکە مانای لێدانەوە .

( وما أنت أعلم به مني ) : لەوەی کە تۆ بەو لە من عالمتری خۆش بیـــە
( أنت المقدم ) : هەر تۆی ئینسان لە دەرەجاتی کەمالاتا پێش ئەخەی •
( وأنت المؤخر ) : هەر تۆی ئینســـــان دوا ئەخەی لــــە گەلەو گورگی
شەیتان بە هیلاکی ئەبا ( لا إله إلا أنت ) : غەیری تۆ مەعبوودی بە حەق
نیە • م-٤/٥٣ •

وعنه ـ أيضاً ـ في رواية أخرى : كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا افتتح الصـلاة كبر ثم قـال : وجهت وجهي ، وقـال : أنـا أول المسلمين ، وقال : وإذا رفع رأسه من الركوع قال : سمع الله لمن حمده ربنـا ولك الحمد • وقال : وصوره فأحسن صوره • وإذا سلم قال : أللهم أغفر لي ما قدمت ••• إلى آخر الحديث ، ولم يقل بين التشـــهد والتســـليم •
م - ٤/٥٧ •

٢/٢١١٤ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : كان [رأيت•أخرى] رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا قام [ إفتتح الصلاة • أخرى ] للصلاة رفع يديه حتى يكونا حذو منكبيه ثم كبر ، فإذا أراد أن يركع فعـل مثل ذلك ، وإذا رفع من الركوع فعل مثل ذلك ، ولا يفعله حين يرفع رأسه من السجود • ح - ٢/٦٩ • م - ٣/٢ • ولا يرفعهما بين السجدتين أخرى • وإذا قام من الركعتين رفع يديه • أخرى • م •

٣/٢١١٥ ـ وعن مالك بن الحويرث [ رضي الله تعالى عنـــه ] نحوه • إلا أنه قال : حتى يحاذي بهما [ فروع • أخـرى ] أذنيـه ، وإذا رفـع مـن الركوع فقال : سمع الله لمن حمده فعل مثل ذلك • ح - ٢/٦٩ • م - ٣/٤ •

تەرجەمە :

ئیبنوعومەرو مالیکی کوڕی حوەیریث ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بـە عیبارەتێکی موتەقارییە ئەفەرموون : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە تەشریفی بۆ نوێژ رابوەستایە هەردوو دەســـتی موبارەکی تا موقابیلی شـانی بەرابەر بە نەرمایی گوێی هەڵەبڕی لە پاشا ( الله أكبر )ی ئەکرد ، کە روکووعی ئەبردو لە روکووع هەڵەســـتایەوە وای ئەکرد ، کە لـــە روکووع هەڵەستایەوە ( سمع الله لمن حمده )ی ئەفەرموو : خوا ـعزوجلـ حەمدی ئەو کەسەی حەمدی بۆ ئەکا ببیێ . یەعنی قوبوولی بکا . لـــە سوجدەدا دەستی هەڵنەئەبڕی .

٢١١٦/٤ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا قام إلى الصـــلاة يكبر حين يقوم ، ثم يكبر حين يركع ، ثم يقول : سمع الله لمن حمده حين يرفـع صـــلبه من الركـوع ، ثم يقول ـ وهو قائم ـ : ربنا ولك الحمد . ثم يكبر حين يهوي ســـاجدا ، ثم يكبر حين يرفع رأسه ، ثم يكبر حين يسجد ، ثم يكبر حين يرفع رأسه . ثم يفعل مثل ذلك في الصلاة كلها حتى يقضيها ، ويكبر حين يقوم من المثنى بعد الجلوس . ثم يقول : إني لأشبهكم صلاة برسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ح ـ ٩٨/٢ . م ـ ٨/٣ ( واللفـظ له ) د ، ن . ونحوه عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ ح ـ ١١٩/٢ .

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە کوللی دانەوینو هەڵسانێکی لە نوێژ ( الله أكبر )ی ئەکرد . ئەیفەرموو : کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە تەشریفی بۆ نوێژ رابوەستایە لە وەختی راوەســـتانیا

( الله أكبر )ی ئەكرد ، كە بۆ روكووع ئەچوو (الله أكبر )ی ئەكرد كە لە روكووع پشتی راستئەكردەوە ئەیفەرموو : ( سمع الله لمن حمده ) كـە تەشریفی لە دوای روكووع رائەوەستا ئەیفەرموو : ( ربنا ولك الحمد ) : ئەی خوایا حەمد هەر بۆ تۆیە لە پاشا كە ئەچوو بۆ سوجدە ( الله أكبر )ی ئەكرد كە لە سوجدە هەڵەستایەوە ( الله أكبر )ی ئەكرد ، لە پاشا كە بۆ سوجدە ئەچۆوە (الله أكبر)ی ئەكرد ، كە هەڵەستایەوە (الله أكبر)ی ئەكرد ، لە پاشا تا لێئەبۆوە لە هەموو نوێژەكەیا وای ئەكرد • كە لە دوای دانیشتن بۆ ركاتی دوەم هەڵەســتایەوە ( الله أكبر )ی ئەكرد • ئەبوهورەیرە لە دوای تەوصیفی نوێژی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە قەول‌و بـــە فیعل ئەیفەرموو : لە خوصووصی نوێژكردنا لە هەمووتان زیاتر ئەشوبهێم بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ •

٢١١٧/٥ ـ عن مطرف قال : صليت أنا وعمران بن حصـــــين خلف علي بن أبي طالب [ رضي الله تعالى عنهم ] فكان إذا سجد كبر ، وإذا رفـع رأسه كبر = وإذا نهض =(١) من الركعتين كبر ، فلما انصرفنا من الصـلاة أخذ عمران بيدي ثم قال : لقد صلى بنا هذا ، أو قال : قد ذكرني هذا صلاة محمد(٢) ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م ـ ٣/١١ •

٢١١٨/٦ ـ عن أبي بَكَرَة [ رضي الله تعالى عنه ] أنه إنتهى إلى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وهو راكع فركع قبل أن يصل الى الصـف • فذكر ذلك للنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : زادك الله حرصـــا ولا تعد • ح ـ ٢/٩٦ • د ، ن •

---

(١) دانەر ـ خ ـ بە هەڵە لە باتی ئەمە ( وإذا رفع رأسه )ی نووسیبوو •

(٢) دانەر ـ خ ـ لەبەر ئەوەی ئەم حەدیثە وەك ریوایەتەكانی تر وایە ماناى لێك نەدایەوە •

**تەرجەمە :**

ئەبوبەكەرە ـ رضـــي الله تعـالى عنـــه ـ گەییە خذمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە روكووعا بوو • ئەبوبەكەرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێش ئەمەدا بگاتە صەفەكە چوو بۆ روكووع • ئەوە عەرزی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كرا • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێی‌فەرموو : خوا حیرصت لەسەر نوێژ زیاد بكا دەفعەیێكی تر وا مەكە •

یەعنی ئینسان با لەوەیش بترسێ كە بە روكووعا نەگا تا داخلی صەف نەبێ نوێژ دانەبەستێو نەچێ بۆ روكووع •

۲۱۱۹/۷ ـ عن عكرمة قال صليت خلف = شـــيخ = [ أبو هريرة ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ] بمكة فكبر ثنتين وعشـــرين تكبيرة ، فقلت لابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] : إنه أحمق • فقـال : ثكلتك أمـك ! سنة أبي القاسم • [ أو ليس ذلك صلاة النبي ؟ أخرى ] ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خ ـ ۹۸/۲ •

**تەرجەمە :**

عەكرەمە ئەلێ : نوێژم لە پشـــت پیاوێكی =پیرەوە= كرد [ كـە ئەبوهورەیرەیە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ]بیستودوو دەفعە ( الله أكبر )ی كرد [ چوار ركات هەر ركاتێ پێنج جار ئەكا بیست ، كە لە تەحیياتـــی ئەوەڵ هەڵەســـتێتەوەو ، كە بۆ تەحیياتی ئاخری لە ســـوجدەی دوەم هەڵەستێتەوە دوو جار ئەكا بیستو دوو ] عەكرەمە ئەلێ : بە ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـم وت [ عەكرەمە وتوویەتی ، من حەددم نیە !] : كە ئەو پیاوە ئەحمەقە ! ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بـــە

عەکرەمەی فەرموو : دایکت رۆڵەڕۆت بۆ بکاو بۆت لە قوڕ بنیشێ ! ئەوە سوننەتی ( ابو القاسم )ە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ =ئەی ئـــەوە نوێژی پێغەمەر ـ صـــلی الله تعـــالی علیه وســـلم نیه ؟= ح-٢/٩٨ ٠
[ عەکرەمەی مەولای ئیبنو عەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ خاریجییە ، ئەمما مەوثووقە ٠ ]

٢١٢٠/٨ ـ وائل بن حجر ـ رضي لله تعالی عنه ـ أنه رأی رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رفع یدیه حین دخل في الصلاة کبّر ، وصـــف همام حیال أذنیه ، ثم التحف بثوبه ، ثم وضـــع یده الیمنی علی الیسری ، فلما أراد أن یرکـــع أخرج یـــده من الثوب ثم رفعهما ، ثم کبر فرکع ، فلما قال : سمع الله لمن حمده رفع یدیه ، فلما ســـجد ـ ســـجد بین کفیه ٠ م ـ ٣/٣٠ ٠

**تەرجەمە :**

وائیلی کوڕی حەجەر [ رضي الله تعالی عنه ] ئەفەرموێ : کـــە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ی دی نوێژی دابەست هەردوو دەستی هەڵبڕیو ( الله أکبر )ی کرد هومام ـ کـە راوییە ـ تەوصـــیفی کرد دەستی تا هەردوو گوێی موبارەکی هەڵبڕی لە پاشا خستیە ژێر لیباسەکەیەوە دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دانا ، کە ئیرادەی روکووعبردنی کـرد دەستی لە لیباسەکەی هێنایە دەرێو هەڵیبڕیو ( الله أکبر )ی کردو چوو بۆ روکووع ٠ کە فەرمووی : ( سمع الله لمن حمده )هەردوو دەســـتی هەڵبڕی ، کە سوجدەی برد سوجدەی لە بەینی هەردوو دەستیا برد ٠

٢١٢١/٩ ـ عن أبي هریرة [ رضي الله تعالی عنه ] صلی بنا رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ یوماً ، ثم انصرف فقال : یا فلان ألا تحســـن

صلاتك ؟ ألا ينظر المصلي إذا صلى كيف يصلي ؟ فإنما يصلي لنفسه ، إني والله لأبصر من ورائي كما أبصر من بين يدي" . م ـ ٣/٧٢ .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەيرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی پێ‌کردین کە لێ‌بووەوە فەرمووی : ئەی فلاّن بۆ چاك نوێژ ناکەی ؟ بۆچی نوێژکەر تێ نافکرێ کە چۆن نوێژ ئەکا ؟ هەر بۆ خۆی نوێژ ئەکا . وەللاّهی من چۆن بەردەمی خۆم ئەبینم پشتی خۆیشم وا ئەبینم .

١٠/٢١٢٢ ـ عن أنس [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صلى بنا رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ذات يوم فلما قضى الصـلاة أقبل علينـا بوجهه ، فقال : أيها الناس إني أمامكم فلا تسـبقوني بالركوع ، ولا بالسجود ، ولا بالقيـام ، ولا بالانصراف ، فإني أراكم أمامي ومن خلفي . ثم قال : والذي نفس محمد بيده لو رأيتم ما رأيت لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا . قالوا : وما رأيت يا رسـول الله ؟ قـال : رأيت الجنـة والنـار . م ـ ٣/٧٣ .

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ نوێژی پێکردین کـە لێ‌بۆوە رووی تێکردین فەرمووی : ئەی ئینسانینە من ئیمامی ئێوەم نە بە روکووع ، نە بە سوجدە، نە بە راوەستان ، نە بە سەلامدانەوە لێم پێش‌مەکەون . مـن ئێوە لـە بەردەممەوەو لە پشتمەوە ئەبینم . لە پاشا فەرمووی : قەسەم بەوەی کـە

نەفسی محەمەد وا لە دەستی قودرەتیا ! ئەگەر ئەوی من دیم ئێوە بتاندیایە کەم پێئەکەنینو زۆر ئەگریان • عەرزیان کرد : ( یارسول الله ) تۆ چیت دی ؟ فەرمووی : جەنەتو جەهەنەمم دی •

١١/٢١٢٣ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رســـول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ قـال : أقرب ما يكون العبـــد من ربـه ـ عز وجل ـ وهو ساجد ، فأكثروا الدعاء • م ـ ٣/١٣٢ •

وعنه ـ أيضاً ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان يقول في سجوده : أللهم اغفر لي ذنبي كلّه : دِقّه وجِلّه ، وأولـه وآخـره ، وعلانيته وسره • م ـ ٣/١٣٣ •

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : نزیکترینی حاڵی عەبد لە خوای خۆیەوە ـ عزوجل ـ ئەو حاڵەیەتی کە لە سوجدەدایە • کە وابێ زۆر دۆعا بکەن •

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ســــوجدەدا ئەیفەرموو : ( اللهم اغفرلي ) : خوایە لێم خۆش ببە ( ذنبیکله ) : لە هەموو گوناهم : (دقه) : لە وردیو ، (وجله) : لە درشتی ( وأوله وآخره ) : لە ئەووەڵیو لە ئاخری • ( وعلانيته ) : لە ئاشکاراییو ( وسره ) : لـەوەی بە دزییەوە کردوومە •

١٢/٢١٢٤ ـ عن الأســود وعلقمة [ رحمهما الله تعالى ] قالا : أتينـا عبدالله بن مســـعود [ رضي الله تعالى عنه ] في داره فقال : أصلّى هؤلاء خلفكم ؟ فقلنا : لا • قال : فقوموا فصلوا ، فلم يأمرنا بأذان ولا إقـامـة •

قال : وذهبنا لنقوم خلفه ، فأخذ بأيدينا فجعل أحدنا عن يمينه والآخر عـن شماله • قال : فلما ركع وضعنا أيدينا على رُكَبِنا ، قـال : فضرب أيدينـا وطبق بين كفيه ثم أدخلهما بين فخذيه • قال : فلما صلى قال : ســـيكون عليكم أمراء يؤخرون الصلاة عن ميقاتها ويخنقونها إلى شَرَقِ الموتى ، فإذا رأيتموهم قد فعلوا ذلك فصـــلوا الصـلاة لميقـاتهـا واجعلوا صــلاتكم معهم سُبْحةً [ نافلة ] وإذا كنتم ثلاثة فصلوا جميعاً ، وإذا كنتم أكثر من ذلك فليؤمكم أحدكم ، وإذا ركع أحدكم فليفرش ذراعيه على فخـذيـه • ولْيَجنَأْ [ يتعطّف • نووي ] وليطبق بين كفيه ، فلكأني أنظر إلى اختلاف أصابع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأراهم •

وفي أخرى : أصلي من خلفكم ؟ قال : نعم • فقام بينهما وجعل أحدهما عن يمينه الى أن قال : فلما صلى قال : هكذا فعل رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م ـ ٣/١٨٨ •

**تەرجەمە :**

ئەســـوەدو عەلقەمە ـ رحمهما الله ـ ئەفەرموون : چووینە خذمــەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ماڵەوە ، فەرمووی: ئەمانە لە پشــــت ئێوەوە نوێژیان کرد یان نـــا ؟ عەرزمانکرد : خەیر • فەرمووی : هەڵســـــــن نوێژ بکەن ، ئەمری نە بە بانگ نە بە قامەت پێنەکردین • فەرموویان : چووین لە پشتیی‌یەوە بوەستین ، دەستی گرتین یەکێکمانی لای راستیەوە ، یەکێکمانی لای چەپیەوە راوەستان ، کە چوو بۆ روکووع دەستمان لەسەر ئەژنۆمان دانا ، لە دەستی داین ، هەردوو بەری دەستی بەیەکەوە نووسان خستیە بەینی هەردوو رانی •

كە نوێژەكەی كرد فەرمووی : لەمەولا بەعزێ ئومەراتان بەســەرەوە ئەبێ نوێژ لە وەختی خۆی دوائەخەن ئەیخنكێنن ؛ تا ئەیخەنە حاڵی غەرغەرەی مردووەوە [ لە وەختی موختاری دوا ئەخەن ، ئەیخەنە ئاخری وەختەوە ، م ] كە چاوتان پێیان‌كەوت وایان كــرد ئێوە لە وەختی خۆیا [ لــە ئەوەڵی وەقتەوە ] نوێژ بكەن ، نوێژتان لەگەڵ ئەوانا بكەن بە نافیلە [ یەعنـــی ئیعادەی نوێژەكان بە جەماعەت لەگەڵ ئەوانا ئەبێ بە نافیلە ] كە سێ كەس بوون هەموو بەیەكەوەنوێژ بكەن [ یەعنی یەكێ ببێ بە ئیمام یەكێكتان لای راستیەوە ، یەكێكتان لای چەپیەوە بوەستن لە پشتیەوە مەوەستن ] ئەگەر سیان زیاتر بوون یەكێكتان ببێ بە ئیمام [ یەعنی ئەوانی تر لە پشـــتیەوە صەف ببەستن ] كە یەكێ لە ئێوە چوە روكووع هەردوو ذیراعی لەســەر رانی رابكێشێ‌و هەردوو لەپی بە یەكەوە بنووسێنێ [ بیخاتە بەینی رانیەوە ( كما فعله ) ] ( كأنه )من چاوم لەیەكتێپەڕبوونی پەنجەی موبارەكـــی پێغەمەرە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێنیشانی دان كە چۆن پەنجـــەی تێك‌پەڕانبوو • لە ریوایەتەكەی تریا ئەفەرموێ : كە نوێژەكەی تەواوكرد فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وای‌كرد •

[ ئەم كەیفیەتە مەنسووخە ]

٢١٢٥/١٣ ـ عن مصعب بن سعد قال : صليت الى جنب أبي ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : وجعلت يديَّ بين ركبتيَّ • فقال لي أبي : اضرب بكفيك على ركبتيك • قال : ثم فعلت ذلك مرة أخرى فضرب يدي وقال : إنا نهينا عن هذا وأمِرنا أن نضرب بالأكف على الركب • م ـ ٣/١٩٢ •

**تەرجەمە :**

مەصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی مالیك ـ رضي الله تعالی عنه ورحمه الله ـ ئەفەرموێ : نوێژم لە تەنیشت باوکمەوە کرد ، هەردوو دەســتم خستە بەینی ئەژنۆمەوە ، فەرمووی : هەردوو بەری دەستت بنێرە ســەر هەردوو ئەژنۆت • دەفعەیێکی تریش دەستم نایەوە بەینی ئەژنۆمەوە باوکم بە دەســـتیا کێشـــام ، فەرمووی : نەهیمان لێ‌کراوە کە وا بکەین ، ئەمرمان پێ‌کراوە کە دەست لەسەر ئەژنۆمان دابنێین •

٢١٢٦/١٤ ـ طاوس يقول : قلنا لابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] في الإقعاء على القدمين • فقال : هي السنة • فقلنا له إنا لنراه جفاء بالرجل • فقال ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] : بل هي سنة نبيك ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ • م ـ ١٩٢/٣ •

**تەرجەمە :**

طاوس ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : عەرزی ئیبن‌وعەباسمان ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کرد : کە لە سەر هەردوو پاشنەی پێمان دابنیشـــین چۆنە ؟ فەرمووی : ئەوە ســـوننەتە • عەرزمان‌کرد : زەحمەتە بۆ پێ ، فەرمووی : بەڵکو ئەوە سوننەتی پێغەمەرتە ـ صلى‌الله تعالى‌عليه وسلم ـ • [ ئەمەیش مەنسووخە ، چونکی سوننەت ئیفتیراشە ] •

٢١٢٧/١٥ ـ رأى حذيفة [ رضي الله تعالى عنه ] رجلاً لا يتم الركوع والسجود ، قال : ما صليت ، ولو مُتّ ـ مت على [ على غير سنة محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أخرى ح ـ ٤٠٠/١ ] غير الفطرة التي فطر الله محمداً ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ • ح ـ ٩٩/٢ • ن ، د •

**تەرجەمە :**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ پیاوێکی دی روکووعو سووجوودی تەواو نەئەکرد ، [ کە نوێژەکەی تەواو کـرد • أخری ]پێی فەرموو : نوێژت نەکردوە ، ئەگەر بمری لەسەر غەیری ئەو ئەخلاقە ئەمری کە خوا ـ عزوجل ـ محەمەدی ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەسەر خەلق کردوە•

٢١٢٨/١٦ ـ عن البراء [ رضي الله تعالى عنـه ] قـال : كـان ركـوع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وسجوده وبين السجدتين وإذا رفع من الركوع ماخلا القيام والقعود قريباً من الســواء • ح ـ ٢/١٠٠ • م ـ ٣/١١٨ • د ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

بەراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ روکووعیو سوجدەییو دانیشتنی لـە بەینی سـوجدەکانیاو راوەستانی لـە دوای ئەمە کە تەشریفی لـە روکووع هەڵسـایەوە لـە موساوات نزیك بوو ، راوەستانی بۆ قیرائەتو دانیشتنی بۆ تەحییات وا نەبوو ، یەعنی طوولیان بوو •

٢١٢٩/١٧ ـ عن عائشـة [ رضي الله تعـالى عنهـا ] قالت : كان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول في ركوعه وسجوده : سـبحانك أللهم ربنـا وبحمـدك ، أللهم اغفـر لي ، [ يتـأول القـرآن • ح ـ ٢/١١٦ ] ح ـ ٢/١٠٢ • م ـ ٣/١٣٣ • د ، ن، جه •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضـي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە روکووعو سوجدەدا ئەیفەرموو : ( سـبحانك ) :

تەسبیحو تەنزیهی تۆ ئەکەم • ( أللهم ) : ئەی خوایا ( ربنا ) : ئـــەی پەروەردگاری ئێمە ( أللهم ) : خوایا ( إغفرلي ) : لێـــم خۆش بیە • عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وســـلم ـ بـــەم دۆعایە تەئویلی قورئانی ئەکرد کە لە روکووعو سوجوودا ئەمری بە تەسبیحو ئیستیغفار ئەفەرموو •

١٨/٢١٣٠ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا قال الإمام : ســـمع الله لمن حمده فقولوا : أللهم ربنا لك الحمد ، فإنه من وافق قولـه قولَ الملائكة غفر له ما تقـــدم من ذنبه • ح ـ ٢/١٠٣ • م ـ ٣/٤٨ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کە ئیمام وتی : ( سمع الله لمن حمده ) : خوا ـ عزوجل ـ حەمدی ئەو کەســە قوبووڵ بکا کە حەمدی بۆ ئەکا ، ئێوە بڵێن : ( أللهم ) : خوایا ( ربنا ) : ئەی پەروەردگاری ئێمە • ( لك الحمد ) : حەمد هەر مەخصووصە بە تۆوە ؛ چونکی لەو وەختەدا مەلائیکە وا ئەفەرموون ، هەرکەسێ حەمدی ئـــەو بەرابەریی بکاو یەکدیگیر بێ لەگەڵ حەمدکردنی مەلائیکە خوا ـعزوجلـ لەو گوناهەی کە لەوەپێش کردوویەتی خۆشەبێ •

١٩/٢١٣١ ـ عن رفاعة بن رافع الزرقي [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كنا يوماً نصلي وراء النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فلما رفع رأســـه من الركعة قال : سمع الله لمن حمده قال رجل [ رفاعة نفســـه ] : ربنا ولك الحمد حمداً كثيرا طيباً مباركاً فيه • فلما انصرف قال : مَنِ المتكلم ؟ قال :

أنا • قال : رأيت بضـــــعة وثلاثين ملكاً يبتدرونها أيهم يكتبهـا أول •
ح ـ ٢/١٠٤ • د ، ن •
[ راجع أول حديث الركوع ][1]

**تەرجەمە :**

رەفاعەی کوڕی رافیع ـ رضـي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژێ نوێژمان ئەکرد لە پشت پێغەمەرەوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کـە سەری لە روکووع بەرزکردەوە فەرمووی : ( سمع الله لمن حمده )پیاوێ ، یەعنی رەفاعە خۆی ، وتی : ( ربنا ولك الحمد حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه ) کە پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وســـلم ـ لە نوێژ سەلامی دایەوە فەرمووی : کێ بوو تەکەللومی کرد بەم کەلیمانە ؟ رەفاعە عەرزی‌کرد : من پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : چاوم‌کەوت بە سـی‌و ئەوەندە مەلائیکە دەست‌پێشـکەری‌یان لە یەکتریی ئەکرد کـە کامیان لـە پێشا بینووسێ •

٢١٣٢/٢٠ ـ عن ثابت قال : كان أنس [ رضي الله تعـالى عنه ] ينعت لنا صلاة النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فكان يصلي فإذا رفع رأسـه من الركوع قام حتى نقول : قد نسي • ح ـ ٢/١٠٤ •

**تەرجەمە :**

ثابیت ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە فیعل وەصفی نوێژی پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆ ئەکردین، نوێژی ئەکرد ، کە سەری لە روکووع بەرزئەکردەوە رائەوەستا ئەوەندە کە ئەمانوت : کە لە فکری چوەتەوە •

(١) مەبەستی حەدیثی ژمارە ( ٢١١٣/١ )یە کە لەم حەدیثە دەچێت .

٢١/٢١٣٣ ـ عن أبي قلابة قال : كان مالك بن الحويرث [ رضي الله تعالى عنه ] يرينا كيف كان صلاة النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وذاك في غير وقت صلاة ، فقام فأمكن القيام ، ثم ركع فأمكن الركوع ، ثم رفـع رأسه فأنْصبَ هُنَيَّةً [ وصلاً وقطعاً ] ٠ قال أبو قلابة : فصلى بنا صلاة شيخنا هذا أبي بريد ، وكان أبو بريد إذا رفع رأسه من الســـجدة الآخرة إستوى قاعداً ثم نهض ٠ ح ـ ٢/١٠٦ ٠

**تەرجەمە :**

ئەبوقەلابە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : مالیـــــکی کوڕی حوەیریث ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە غەیری وەختی نوێــژا بوو ، نوێژی پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێ‌نیشان ئەداین کە چۆنی ئەکرد : ڕاوەستا دوورو درێژ روکووعی برد دوورو درێژ ســـەری لە روکوع بەرزکردەوە کەمێ وەستا ٠ ئەبوقەلابە ئەڵێ : نوێژی ئەم مامۆستایەی ئێمەی بۆ کردین کە ئەبوبەریدە ، ئەبوبەرید ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە ســـــوجدەی ئاخریی هەڵەستایەوە راست دائەنیشت لە دواییدا هەڵستایە پیان ٠ یەعنی جەلسەی ئیستیراحەتی ئەکرد ٠

[ ئەبوقەلابە ضەعیفە ، بەعزێ حەدیث تێـــکەڵو پێکەڵ ئەکا وەك حەدیثی قەســـامە کە ( إن شاء الله ) لە بەحثی ( قصاص )ا ییێت ٠ فەقەط ئیعتیمادی بوخاریی بە حەدیثەکەی کافیە بۆی ] ٠

٢٢/٢١٣٤ ـ عن عبدالله بن مالك بن بجينة [ رضي الله تعالى عنه ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان إذا صلى فرّج بين يديه حتى يبدو بياض إبطيه ٠ ح ـ ١/٤٠١ ٠ ح ـ ٢/١١٢ ٠ م ـ ٣/١٤٤ ٠ ٠ ن ٠

**تەرجەمە :**

ئیبن‌وبوجەینە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە نوێژی ئەکرد دەستی ئەوەندە لە یەك بلاوئەکردەوە تا سپیایی بن‌باخەڵی دەرەکەوت •

٢١٣٥/٢٣ ـ عن ابن عبـاس [ رضـي الله تعـالى عنهما ] أُمِرَ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أن يسجد على ســـبعة أعضاء ولا يَكُفَّ شعراً ولا ثوبا : الجبهة ، واليدين ، والركبتين ، والرجلين • وفي أخرى عنه عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : أُمِرْنـا أن نسجد على سبعة أعظم ولا نكف ثوباً ولا شعرا • ح ـ ١١٣/٢ • م ـ ١٤٠/٣ • وعن أبيه نحوه • م ـ ١٤٢/٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەمری پێ‌کراوە ـ لە ریوایەتەکەی ترا فەرمووی : ئەمرمان پێ‌کراوە ـ لەسەر حەوت ئەعضا [ لەسەر حەوت ئێسقان • أخرى ] سوجدە ببەین : لەسەر ناوچاوان‌و ، هەردوو بەری دەســـتو ، هەردوو ئەژنۆو ، هەردوو پێ • ئەمرم پێ‌کراوە کە جـــل نەگرین‌و موو نەگرین • یەعنی نەیانخەینە لاوەو مەنعیان نەکەین لە سوجدە •

ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم بیست ئەیفەرموو : کە عەبد سوجدەی برد حەوت طەرەفی لەگەڵ ئەو ســـوجدە ئەبا : رووی‌و ، بەری دەستی‌و ، هەردوو ئەژنۆی‌و ، هەردوو پێی •

٢١٣٦/٢٤ ـ عن أبي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا رفع رأسه من الركوع قـال :

ربنا لك = الحمد = ملء السماوات والأرض ، وملء ما شـــئت من شيء بعد ، أهل الثناء والمجد ، أحق ما قال العبد ، وكلنا لك عبد . أللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ، ولا ينفع ذا الجدّ منك الجدّ . م – ١٢٥/٣

**تەرجەمە :**

ئەبوسەعیدی خدریی – رضـي الله تعالى عنه – ئەفەرموێ : پێغەمەر – صـــلى الله تعالى عليـه وسـلم – كە سـەری لە روكووع بەرزەكردەوە ئەیفەرموو : ( ربنا ) : خوایا ( لـــك الحمد ) : حەمد هەر بۆ تۆیە . ( ملء السماوات والأرض ) : پڕ بە هەموو ئاسمانو ئەرز ( وملء مـــا شئت من شيء بعد ) : پڕ بـەو شـتەی كە لـە پاش ئەرزو ئاسمان خۆت ئیرادەی بكەی . ( أهل الثناء والمجد ) : ئەی ئەو كەسەی كە لایەقی بـە مەدحو گەورەیی ( أحق ) : زۆر حەقە ( مـا ) : ئەوەی ( قـال العبد ) : كە عەبدی تۆ محەمەد – صـــلى الله تعالى عليه وســـلم – فەرمووی . ( وكلنا ) : ئێمەیش هەموو ( لك ) : هەر بۆ تۆ ( عبد ) : عەبدین . عەبدەكەی فەرموویەتی : ( أللهم ) : خوایا ( لامانع ) : هیچ مانیع نیە ( لما ) : بۆ ئەوەی ( أعطيـــت ) : تـــۆ عەطاتكردوەو ئەیكەی . ( ولامعطي ) : هیچ دەهەندە نیە ( لما منعت ) : بۆ ئەوەی كـــــە مەنعتكردوەو بیكەی . ( ولا ينفع ) : هیچ فائیدە نادا ( ذا الجد ) : بە صاحیب ثەروەت . ( منك ) : لە عەذابی تۆ . ( الجد ) : ثەروەتەكەی .

٢١٣٧/٢٥ – عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] قـال كشـــف رسول الله – صلى الله تعالى عليه وسلم – الستارة [ ورأســـه معصـوب في مرضه الذي مات فيه . أخرى . ] والناس صفوف خلف أبي بكر [ رضي الله تعالى عنه ] فقال : [ أللهم هل بلغت ؟ ثلاث مرات . أخرى ] أيها الناس إنـه

لم يبق من مبشرات النبوة إلا الرؤيا الصالحة يراها المسـلم أو ترى لـه • ألا وإني نُهِيتُ أن أقرأ القرآن راكعاً أو ساجدا ، فأما الركوع فعظموا فيه الرب ـ عز وجل ـ وأما السجود فاجتهدوا في الدعاء فقَمِنٌ أن يستجاب لكم • م ـ ١٢٨/٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضـي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : لەو رۆژەدا[1] کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وەفاتی کرد پەردەی حوجرەی سەعادەتی لادا ، سەری موبارەکی پێچرابوو ، خەڵق لە پشت ئەبوبەکرەوە ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە نوێژا صەفیان بەستبوو ، سێ جار فەرمووی : خوایا ئایا ئەحکامی تۆم تەبلیغ کردن ؟ ئەی ئینسانان لە موبەششـیراتی نوبووەت غەیری روئیای صالحیە[2] کە پێنیشانی موسـولمانان ئەدرێ ئەیبینن هیچی تر نەماوە کە خەبەرتان بدرێتێ •

خەبەرتان بێ کە من نەهیم لێ کراوە کە =لە= روکووعا یـا لـە سوجدەدا قورئان بخوێنم • لە روکووعا تەعظیمی خوا بکەن ـ عزوجل ـ لە سوجدەدا زۆر سەعی لە دۆعاکردنا بکەن ، ئەو دۆعاکردنە لایەقە بەوە خوا لێتان قەبووڵ بکا •

٢١٣٨/٢٦ ـ عن علي [ رضي الله تعالى عنه ] قال : نهاني رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن القراءة في الركوع والسجود ، ولا أقول نهاكم • م ـ ١٢٩/٣ •

---

(١) ئەم وتەیە دەبێ تەرجەمەی ( في مرضه الذي مات فيه ) بێ ئەوەیش بەم جۆرە ماناکەی تەواو نیەو دەبوو بیگوتایە : ( لەو نەخۆشیەدا ... ) .

(٢) خەوە ڕاستەکان .

**تەرجەمە :**

ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەهی لە مـن کردوە کە قورئان بخوێنم لە روکووعو سوجوودا نالێم کە نەهی لە ئێوە کردوە ٠

٢١٣٩/٢٧ ـ عن عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : كان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يكثر [ قبل أن يموت ٠ أخرى م ] من قول سبحان الله وبحمده استغفر الله وأتوب إليه ٠ قالت : فقلت : يا رســول الله أراك تكثر من قول سبحان الله وبحمده أستغفر الله وأتوب إليه ؟ [ ما هـذه الكلمات التي أراك أحدثتها تقولها ؟ أخرى ، م ] فقال: خبرني ربي ـعز وجلـ إني سأرى علامة في أمتي [ جعلت لي عـلامـة في أمتي ٠ أخرى ٠ م ] فإذا رأيتها أكثرت من قول سبحان الله وبحمده استغفر الله وأتوب إليه ٠ فقـــد رأيتها ( إذا جاء نصر الله والفتح ٠٠٠ ) في فتح مكة ، إلى آخر الســـورة ٠ م ـ ١٣٤/٣ ٠

**تەرجەمە :**

عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە پێش وەفاتيا زۆری ئەفەرموو ( سبحان الله ) تەنزیهی خوا ئەکەم ( وبحمده ) : حەمدی خوا ئەکەم ٠ ( أستغفر الله ) : طەڵەبی عەفو لە خوا ئەکەم ٠ ( وأتوب إليه ) : وەرەگەڕێمەوە سەر خــــوا ٠ عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : عەرزمکرد : ( یارسول الله ) ئەم کەلیمانە چیـــە پەیداتکردوەو ئەیفەرمـــووی ؟ زۆر ئەفەرمووی : ( سبحان الله وبحمده أستغفر الله وأتوب إليه ) پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : خوا ـ عزوجل ـ بۆ من دەرحەق ئوممەتی مـن

عەلامەتی بۆ داناوم ، خەبەری داومێ کە لە ئوممەتما گەلێ عەلامەت ئەبینم کە مردنم نزیکە ، کە دیم ئەوە زۆر ئەڵێم ، وا دیومە کە نوزوولی ( إذا جاء نصر الله ) ( إلى آخر السورة ) : کە یاریەی خواو فەتحی مەکەت بۆ کراو ـ هات چاوت بە خەڵق =کەوت= کە فەوج ـ فەوج داخڵی دینی خوا ئەبن ئەوە عەلامەتی مردنتە وا بۆت هات ، کە وابێ تەسبیحی ئیسمی خوا بکەو ئیســـتیغفاری گوناهتی لێ بکە ؛ چونکی خوا زۆر تەوبە قەبووڵ کەرە ، یەعنی رەدی ناکاتەوە •

٢١٤٠/٢٨ ـ وعنها [ رضي الله تعالى عنها ] : ما رأيت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ منذ نزلت عليه ( إذا جاء نصر الله والفتح ••• ) يصـــلي صـــلاة إلا دعا أو قال فيهـا : ســـبحانك ربي وبحمدك أللهم اغفر لي •

م ـ ٣/١٣٤ •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : لەو وەختەوە کـــە ( إذا جاء ) نازڵبوو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ م نەدی کـە نوێژێ بکاو دۆعای تیا نەکا ، یا نەڵێ ( ســـبحانك ربي وبحمدك أللهم اغفرلي ) •

٢١٤١/٢٩ ـ عن عائشه [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : افتقدت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ذات ليلة فظننت أنه ذهب إلى بعض نسائه ، فتحسست ثم رجعت • فإذا هو راكع أو ســاجد يقول : سبحانك وبحمدك لا إله إلا أنت • فقلت : بأبي أنت وأمي إني لفي شأن وإنـك لفي آخـر •

م ـ ٣/١٣٥ •

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : شــــەوێ

پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە جێدا نەبوو وا تێگەییم تەشریفی چۆتە لای یەکێ لە ژنەکانی ، چووم بۆی گەڕام ، لە پاشا گەڕامەوە کەچی لە روکووعا بوو ، یا فەرمووی : لە سوجدەدا بوو ئەیفەرموو : ( سبحانك وبحمدك لا إله إلا أنت ) وتم : باوك‌و دایکم بە فیدات بێ من لە خەیالێکام‌و تۆ لە خەیالێکی ترای !

٢١٤٢/٣٠ ـ عن عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : فقدت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ليلة من الفراش فالتمسته ، فوقعت يدي على بطن قدمه ، وهو في المسجد ، وهما منصوبتان ، وهو يقول : أللهم إني أعوذ برضاك من سخطك وبمعافاتك من عقوبتك ، وأعوذ بك منك لا أحصي ثناء عليك ، أنت كما أثنيت على نفسك ٠ م ـ ٣/١٣٦[1] ٠

٢١٤٣/٣١ ـ وعنها أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان يقول في ركوعه وسجوده : سُبُّوح قُدّوس ، رب الملائكة والروح ٠ م ـ ٣/١٣٦ ٠

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : شەوێ پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ناو جێدا نەبوو ، بۆی گەڕام دەستم لەبەری پێی‌کەوت هەڵی‌نابوو ، لە مزگەوتا بوو ئەیفەرموو : ( أللهم ) : خوایـــا ( إني ) : بە تەحقیق من ( أعوذ ) : پەنا ئەگرم ( برضاك ) : بـــــە

(١) دانەر ـ خ ـ لە دوای ئەم حەدیثەوە ئەمەی نووسیوە : « تەماسی ژن‌و پیاو ئەگەر دەزنوێژی بشکانایە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دەزنوێژەکەی تازە ئەکردەوە . نە ئەوە مەعلوومە ، نە ئەوەیش کـــە مەسحی لە پێدا بووبێ . ئەمە دەلالەت ئەکا کە ( أو لامســـــــتم ) ـ النساء/٤٩ ـ بە مەعنا لێکەوتن نیە . رەشید » .

رازیبوونت لێم ( من سخطك ) : لە قەهرگرتنت لێم • ( وبمعافاتك ) : هەم پەنا ئەگرم بـە عەفوکردنت • ( من ) : لـە ( عقوبتـك ) : عەذابت • ( و ) : هەم ( أعوذ ) : پەنا ئەگرم • ( بك ) : بە تۆ ( منك ) : لـە تۆ • ( لا أحصي ) : ناتوانم بە تەواوەتی بەجیٚبێنم • ( ثناء ) : ثەنای لایەق بە تۆ • ( عليك أنت ) : لەسەر تۆ • ( كما أثنيت ) : وەکـــوو ثەناتکردوە ( على ) : لەسەر ( نفسك ) : خۆت •

هەم عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە روکووعو سوجدەیا ئەیفەرموو ( سبوح ) : زۆر مونەززەهە • ( قدوس ) : زۆر موقەددەسو موبارەکو پاکە لە صـيفاتێ کە نەقص بێو لایەق نەبێ بە کەماڵی عەظەمەتی ئەو • ( رب الملائكة ) : پەروەردگاری مەلائیکەو ( والروح ) : رۆحە کە جيبريلە ـ عليه السلام ـ•

٢١٤٤/٣٢ ـ معدان بن أبي طلحة اليعمُري قال : لقيت ثوبان [ رضي الله تعالى عنه ] مولى رســـــول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقلت : أخبرني بعمل أعمله يدخلني الله به الجنة • أو قـال : قلت : بأحب الأعمال إلى الله [ تعالى ] فسكت ، ثم ســألته فســـكت • ثم سألته الثالثة ، فقال : سألت عن ذلك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : عليك بكثرة السجود لله ؛ فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله ـ عز وجل ـ = بها = درجة وحط عنك بها خطيئة • قال معدان : ثم لقيت أبا الدرداء فســـألته فقال لي مثل ما قال ثوبان [ رضي الله تعالى عنهما ]• م ـ ٣/١٣٨ •

**تەرجەمە :**

مەعدانی کوڕی ئەبوطەلحەی یەعموریی ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : تووشی ثەوبانی ئازادکراوی پێغەمەر بووم ـ صـلى الله تعالى عليه وسـلم

ورضي عنه ـ ليّم‌پرسيى : عه‌مه‌ليّكم پىّ بلىّ كه بيكه‌مو خوا به واسيطه‌ى ئه‌و عه‌مه‌له‌وه بمخاته به‌هه‌شته‌وه • يا مه‌عدان وتى : عه‌رزم‌كرد : خه‌بـه‌رم بده‌رىّ كه خوّشه‌ويسترينى ئه‌عمال لاى خوا چيه ؟ [ راويى لـه مه‌عدانه‌وه ته‌ره‌دودى بوه كه مه‌عدان له‌م دوو له‌فظه كاميانى وت ] ثه‌وبان ـ رضـي الله تعالى عنه ـ بيّده‌نگ بوو دووباره ليّم‌پرسى ديسان بيّده‌نگ بوو ، له جارى سيّيه‌ما فه‌رمووى : ئه‌وه‌م له پيّغه‌مه‌ر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پرسى ، فه‌رمووى : لازمى سوجده بوّ خوابردنى زوّر ببه ؛ چونكى هيچ سوجده‌يىّ بوّ خوا نابه‌ى كه به‌و سوجده‌يه خوا ـ عزوجل ـ پايه‌يـــىّ بلندت نه‌كاته‌وه‌و گوناهيّكت هه‌لّنه‌وه‌ريّنىّ • مه‌عدان ئه‌فه‌رموىّ : بـــه ئه‌بوده‌ردا ـ رضي الله تعالى عنه ـيش گه‌ييم ليّم‌پرسى ئه‌ويش واى جواب دامه‌وه •

بيّده‌نگ‌بوونى ثه‌وبان ـ رضي الله تعالى عنه ـ دووجار بوّيه نه‌بوه كه كه‌تمى عيلم بكا ، بوّيه بوه كه فـــكرى ليّ‌بكاته‌وه‌و موافيقى مه‌طلووبى مه‌عدان شتيّك بيّنيّته‌وه فكرى جوابى بداته‌وه ( وإلا ) ئينسان هه‌ركه‌سىّ ريّيّكى دينى ليّ بپرسىّ ، ئه‌گه‌ر بيزانىّ ، واجبه له‌ســه‌رى ئه‌و ريّگه‌يه‌ى پىّ‌نيشان بدا •

٢١٤٥/٣٣ ـ ربيعة بن كعب الأسلمي [ رضي الله تعالى عنـه ] قـال : كنت أبيت مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فآتيه بوَضــوئه وحاجته • فقال لي : سل • فقلت : أسألك مرافقتك في الجنة • قال : أو غير ذلك ؟ قلت : هو ذاك • قال : فأعني على نفســـك بكثرة الســـــجود •

م ـ ٣/١٣٩ •

**تەرجەمە :**

رەبیعەی کوڕی کەعبی ئەســــلەمیی ـ رضـــي الله تعـالی عنه ـ ئەفەرموێ : شەو لە خزمەت پێغەمەرا ـ صـــلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەنوستم ، ئاوی دەزنوێژو ئیحتیاجی ترم بۆ ئەبرد • فەرمووی : طەلەب بکە • عەرزمکرد : رەفیقایەتیی تۆم ئەوێ لە بەهەشتا • فەرمووی : یــــا غەیری ئەوە ؟ عەرزمکرد : هەر ئەوەم ئەوێ • فەرمووی : کە وابێ بــــە سوجدەبردنی زۆر یاریم بدە لەسەر نەفسی خۆت •

٢١٤٦/٣٤ ـ عن ابن عباس ـ رضـــي الله تعـالی عنهما ـ أنـه رأی عبدالله بن الحرث یصلي ورأسه معقوص من ورائـه فقـام فجعـل یَحلُّه • فلما انصرف أقبـل الی ابن عباس [ رضي الله تعالی عنهما ] فقـال : مـا لك ورأسي ؟ فقال : إني سمعت رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ یقول : إنما مثل هذا مثل الذي یصلي وهو مکتوف • م ـ ١٤٣/٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالی عنه ـ عەبدوڵلای کوڕی حەرثی دی نوێژی ئەکرد ، سەری بۆ پشتەوە بەسترابوو • عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالی عنه ـ دەستیکرد بە کردنەوەی سەری • کە عەبدوڵلای کوڕی حەرث لە نوێژەکەی بۆوە وتی : دەخڵت چیە بەسەر ـ ســــەرمەوە ئەیکەیتەوە ؟ عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـم بیست ئەیفەرموو : مەثەلی ئەو کەسەی کە وا نوێژ بکا وەك مەثەلی ئەو کەسەیە کە نوێژ بکاو شانو ملی لە کۆتا بێ •

٢١٤٧/٣٥ ـ عن ميمونة [ رضي الله تعالى عنها ] قـالت : كـان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا سجد لو شاءت بَهْمة أن تمرَّ بين يديـه لمرَّت • م ـ ٣/١٤٥ •

٢١٤٨/٣٦ ـ وعنها إذا سـجد خوّى بيديه ، تعني جنح ، حتى يرى وضح إبطيه من ورائه ، وإذا قعد اطمأن على فخذه اليسرى •

**تەرجەمە :**

مەیموونەی حەرەمی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي عنها ـ ئەفەرموێ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە سوجدەی ئەبرد ئەگەر بەرخو کارژۆڵە ئیرادەی بکردایە بە بەینی هەردوو دەستیا بڕۆییایە ئەڕۆیی •

ئەفەرموێ : کە سوجدەی ئەبرد دەستی ئەوەندە بڵاوئەکردەوەو لـە خۆیی دوور ئەگرت تا لە پشتەوە سپیایی بنباخەڵی ئەبینرا • کــــە دابنیشتایە [ بۆ تەحییات یا جولووسی ( بين السجدتين ) یـا جەلســەی ئیستیراحەت ][1] ئیعتیمادی ئەدایە سەر رانی چەپی •

٢١٤٩/٣٧ ـ عن أنس بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : اعتدلوا في السجود ، ولا يبسط أحدكم ذراعيه انبســـاط الكلب • ح ـ ٢/١١٨ • م ـ ٣/١٤٤ • د ، ت ، ن • وعن البراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ نحوه • م ـ ٣/١٤٤ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لە سوجدەدا چاك

(١) مەبەستی دانیشتنی نێوان سوجدەکانو دانیشتنی پێش هەڵسانەوەیە لە دوای سوجدەی دوەم .

بوەستن ، چاك سوجدەبەرن ، دەستتان بەســـــەر ئەرزا رامەكێشن وەك ( كەلب )[1] كە رای ئەكێشێ •

٢١٥٠/٣٨ ـ عن مالك بن الحويرث الليثي ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه رأى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يصلي فإذا كان في وتر من صلاته لم ينهض حتى يستوي قاعدا • ح ـ ١١٨/٢ • د ، ت ، ن • [ قـد مر في حديث أبي قلابة ][2] •

**تەرجەمە :**

مالیكی كوڕی حوەیریثی لەیثیی ئەفەرموێ : پێغەمەرم دی ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كە لە سوجدەی دوایی ركاتی یەكەم‌و ســــێیەم هەڵەستایەوە تا دانەنیشتایە هەڵنەئەستایە سەر پیان •

**روكووع ، سوجوود ، ئیعتیدال ( جلوس بين السجدتين ) :**

٢١٥١/٣٩ ـ عبدالله بن أبي أوفى [ رضي الله تعالى عنهما ] يحدث عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه كان يقول : أللهم لـك الحمد ملء السماوات وملء الأرض وملء ما شئت من شيىء بعد • أللهم طهرني بالثلج والبرد وماء البارد • أللهم طهرني من الذنوب والخطـايـا كما ينقى الثوب الأبيض من الوسخ [ من الدرن • معاذ ـ من الدنس يزيد ] م ـ ١٢٤/٣ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای بنی ئەبی ئەوفا ـ رضـي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەیفەرموو [ لـە دوای روكووع‌و

---

(١) ســـەگ •

(٢) مەبەستی حەدیثی ( ٢١٣٣/٢١ )یە •

ئەوقاتی سائیره ] خوایا پڕ بە ئەرزو ئاسمانو ئەوی خۆت ئیرادەت کردوه حەمدت ئەکەم ، خوایا پاکم بکەیتەوە لە گوناه بـە بەفرو تەرزەو ئـاوی سارد ، خوایا پاکم بکەیتەوە لە گوناه وەك جلی سپی لە چڵكو پیسیی پاك ئەکرێتەوە ٠

**قـونـووت :**

٢١٥٢/٤٠ ـ قال هشام بن عروة : أخبرني أبي قـال : لما قتل الذين ببئر معونة ، وأسر عمرو بن أمية = الضمري = [ رضي الله تعالى عنه ] قال له عامر بن الطفيل : من هـذا ؟ فأشـــار إلى قتيـل ، فقال له عمرو بن أمية [ رضي الله تعالى عنه ] : هذا عامر بن فهيرة [ رضي الله تعالى عنه ] فقـال : لقد رأيته بعد ما قتل رفع إلى السماء حتى إني لأنظر إلى السـماء بينه وبين الأرض ، ثم وضع فأتى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خبرهم فنعاهم ، فقال : إن أصحابكم قد أصيبوا ، وإنهم قد سألوا ربهم ، فقالوا : ربنا أخبر عنا إخواننا بما رضينا عنك ورضيت عنا ، فأخبرهم عنهم ، وأصيب يومئـذ فيهم عروة بن أسماء بن الصلت [ رضي الله تعالى عنه ] فســـمي [ عروة بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] به ومنذر بن عمرو [ رضي الله تعـالى عنه ] سمي به منذر [ أي ابن العوام ٠ ح ـ ٣٠٦/٦ ٠ مرسل لأن عروة لم يدرك الوقعـة ] ٠

**تەرجەمە :**

عوروە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : کە ئەوانەی لە بیئری مەعوونەدا شەهیدکرانو عەمری کوڕی ئومەییەی کوڕی صەلت ئەسیر کرا عامیری کوڕی طوفەیل ـ کە کوشتبوونی ـ لێیپرسیی : ئەمە کێیە ؟ ئیشـارەی شەهیدێکی کرد ٠ عەمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەمە عامیری

کوڕی فوهەیرەیە • عامیری قاتیل وتی : چاوم پێی‌کەوت کە کوژرا هەڵگیرا بۆ ئاسمان ، تەماشای ئاسمانم ئەکرد لە مابەینی ئەوو ئەرزا ، لە پاشـــــا دانرایەوە • جیبریل ـ علیه السلام ـ خەبەری دا بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێغەمەریش ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ خەبەری دان بە ئەصحابی کیرام ؛ فەرمووی : رەفیقەکانتان شەهیدکران ، سوئالیان لە خوا کرد کە خەبەریان بە ئێوە بدا • عەرزیان کرد : ( ربنا ) : ئەی رەببی ئێمە ( أخبرعنا ) : خەبەرمان لێ‌بدە ( قومنا ) : بە قەومەکەمان ( بما ) : بەوەی ( رضينا عنك ) : کە ئێمە لە تۆ رازیی بووین • ( ورضيت ) : تۆیش رازی‌بووی • ( عنا ) : لە ئێمە • خوا خەبەری لێدان • لـــەو رۆژەدا عوروەی کوڕی ئەسماء شەهیدکرا عوروەی راویی بە ناوی ئەوەوە ناونرا • مونذیری کوڕی عەمریش شەهیدکرا مونذیری برای عوروەیشـ بە ناوی ئەوەوە ناونرا •

٢١٥٣/٤١ ـ خفاف بن إيماء الغفاري [ رضي الله تعالى عنه ] قـال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أللهم العن بني لحيان ورعلا وذكوان وعصية عصوا الله ورسوله • غفار غفر الله لها ، وأسلم سالمها الله • م ـ ٩/٤١٧ •

٢١٥٤/٤٢ ـ خفاف بن إيماء [ رضي الله تعالى عنه ] قال : ركع رسول الله ثم رفع رأسه فقال : غفار غفر الله لها ، وأسلم سالمها الله ، وعصـــــية عصت الله ورسوله • أللهم العن بني لحيان ، والعن رعلا وذكوان ، ثم وقع ساجدا • قال خفاف [ رضي الله تعالى عنه ] : فجعلت لعنة الكفرة = من أجل ذلك = • م ـ ٣/٣٨٥ •

**تەرجەمە :**

خوفافی کوڕی ئیما ـ رضـــي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویٚ : پیٚغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ چوو بۆ روكووع ، له پاشا كه هەڵسايەوه فەرمووی : غیفار خوا لێیان خۆش بیٚ ، ئەسلەم خوا ســەلامەتی بكا . عەصییه له خواو رەسوولی خوا عاصیی بوه . خوایا بەنیلەحیانو ، ریعلو ، ذەكوان به لەعنەت كه . خوفاف ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویٚ : لەبەر ئەمەیە كه لەعنەت له كافر ئەكریٚ .

٤٣/٢١٥٥ ـ حدث [ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بعث خاله [ حرام بن ملحان ] أخ لأم سليم [ رضي الله تعالى عنها ] في سبعين راكباً [ إلى بني عامر ] وكان رئيس المشركين عامر بن الطفيل خَيَّر [ النبي ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ ] لما أتاه بين ثلاث خصال : فقال : يكون لك أهل السهل ولي أهل المدر [ أي البـــلاد ] ، أو أكون خليفتك ، أو أغزوك بأهل غطفان بألف [ أشقر ] وألف [ أحمر ] فطعن عامر [ بدعائه ـ عليه الصلاة والسلام ـ حيث قال : أللهم اكفني عامرا ] في بيت أم فلان ، في بيت إمرأة من آل فلان [ سـلول ] فقـال : غـُدّةٌ كغـُدّةِ البَـكْر ، إئتوني بفرسي ، فمات على ظهر فرسه ، فانطلق حرام أخ أم سُليم [ رضي الله تعالى عنهما ] وهو رجل أعرج ورجل من بني فلان [ وفي رواية : فانطلق حرام ورجلان معه ، رجل أعرج ورجل من بني فلان الأعرج كعب بن زيد ، والآخر منذر بن محمد ] قال : كونا قريبا مني حتى آتيهم ، فإن آمنوني كنتم قريبا ، وإن قتلوني أتيتم أصحابكم . فقال : أتؤمنوني أبلغ رســالة رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ؟ فجعل يحدثهم وأومأوا الى رجل فأتاه من خلفه فطعنه . قال همام : أحسبه حتى أنفذه بالرمح . قال : الله أكبر

فزت ورب الكعبة ! فلحِق الرجل فقتلوا كلهم غير الأعرج كـان في رأس جبل ، فأنزل الله تعالى علينا ـ ثم كان من المنسوخ ـ : ( إنا قـد لقينا ربنـا فرضي عنا وأرضانا ) فدعا النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عليهم ثلاثين صباحاً على : رعل ، وذكوان ، وبني لحيان ، وعصية الذين عصـــوا الله ورسوله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ح ـ ٦/٣٠٤ ٠

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حەرامی خاڵی ئەنەسی ، کە برای ئوممومسولەیمە ، لەگەڵ حەفتا کەسا نارد بۆ بەنیعامیر [ کە تەعلیمیان بکەنو دەعوەتیان بکەن ، ئـــەو وەختە ] گەورەی موشریکان عامیری کوڕی طوفەیل بوو ، عامیر کە هاتە خذمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە بەینی سێ شتا موخەییەر کرد : عەرزیکرد : یا صەحرایی بۆ تۆ بێو شارستانیی بۆ من ، یا بمکەی بە خەلیفە لە دوای خۆت ، یـا هەزارو هەزارت یێنمە سەر شەڕت لەگەڵا ئەکەم !

بە دۆعای پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە فەرمووی : خوایا عامیرم لێ دەفع بکە ! عامیر لە ماڵی دایکی فلانا طاعوونی لێدا ، وتـــی لوویێکە وەك لووی وشتری بە قووەت ، ئەسپەکەم بۆ بێنن ٠ بەســـەر ئەسپەکەیەوە تۆپی ! حەرامی برای ئوممومسولەیم ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [ لە پێش ئەم وەقعەدا لەگەڵ حەفتا کەسەکەدا چوو بۆ ئەو طەرەفە کــــە ئــەمـری پێــکرابوو ] خــۆیو دوو کـــەس یـەکێکیـان کــە کەعبی کوڕی زەیـد بـوو شـــــەل بـوو ، ئـەوی تـریـان مونذیـر بوو کــوڕی محـەمـەد [ رضـــي الله تعـــالى عنهما ] چوون ، حـەرام بـەو

دوانـەی فەرموو : ئێوە لێمەوە نـزیـك بن تـا بچمە لایـان ، ئـەگـەر ئەمانیان پێدام کە نەمکوژن وا ئێوە لێم نزیکن ، ئەگەر کوشتمیان ئێـوە خەبەر بدەن بە باقیی رەفیقەکاتتان • حەرام ـ رضي الله تعالی عنه ـ بـــە موشریکەکانی فەرموو : ئەمانم ئەدەنێ کە کاغەزی پێغەمەرتان ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەبلیغ بکەم ؟ ئەمانیان دا • قســـەی لەگەڵ ئەکردن ئیشارەتی یەکێکیان کرد لە پشتەوە هات رمێکی لێدا تا رمەکەی لەم دیویەوە دەرچوو • حەرام ـ رضـــي الله تعالی عنـــه ـ فەرمووی : ( الله أکبر ) قەسەم بەرەببی کەعبە فەوزیاببووم[1] ! بەوانی تریشـ گەیین هەموویان شەهیدکردن ، غەیری پیاوە شەلەکە لەسەر شاخێ بوو • ئەنەس ـ رضـــي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : دەرحەقیان قورئان نازڵ بوە سەرمان لـــە پاشا نەسخکرایەوە [ قورئانە مەنسوخەکە ئەوەیە ] : ( إنا ) : بـــە تەحقیق ئێمە ( قـد لقینـا ربنـا ) : بە تەحقیق گەیینە حوضـــووری خوا ( فرضي ) : رازیی بوو ( عنا ) : لێمان • ( وأرضانا ) : ئێمەیشی لـە خۆی رازییکرد • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـسی ســـبەینێ دۆعای لە : ریعلو ، ذەکوانو ، بەنی لەحیانو عوصەییە کرد کە لە خوا ـ عزوجل ـو رەسوولی ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ عاصي بوون •

٤٤/٢١٥٦ ـ عاصم [ بن سليمان الأحول ] قال : سألت أنس بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] عن القنوت فقال : قـد كـان القنوت [ مشروعاً ] • قلت : قبل الركوع أو بعده ؟ قال : قبله • قال [ قلت ] : فإن فلاناً أخبرني عنك أنك قلت بعد الركوع • فقال : كذب ، إنما قنت رسول الله ـ صلى الله

(١) پیرۆزترین پلەی مردنی موســـــولمان ( شەهادەت )ە بۆیـە حـەرام فەرمووی : بە خوای کەعبە ! گەیشتم بە پیرۆزیی کە شهادەتە !

تعالى عليه وسلم ـ بعد الركوع شـــهرا أُراه ، كان بعث قوماً يقال لهم : القراء ، زُهاء سبعين رجلاً إلى قوم مشركين دون أولائك ، وكان بينهم وبين رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عهد [ فغدروا وقتلوا القراء ] فقنت رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ شـــهراً يدعو عليهم • ح ـ ٢٢٣/٢ • ح ـ ٣٠٧/٦ ، ح ـ ٢١٢/٩ جنائز ، ح ـ ٢٢٨/٥ جزية ، م ـ ٣٨٤/٣ • جزية •

**تەرجەمە :**

عاصیم ئەفەرموێ : لە ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـم لە حەقـــی قونووت سوئاڵکرد ، فەرمووی : قونووت بوە • عەرزمکرد : لە پێش روکووعا یا لە دوای روکـــووع • فەرمووی : لـــە پێش روکووعا • عەرزمکرد : فلانکەس لە تۆوە خەبەری داومێ کـــە فەرمووتە لە دوای روکووع بوە • فەرمووی : درۆی کردوە • ئەوە پێغەمەر ـ صـــلی الله تعالى عليه وسلم ـ لە قەومێکی نزیکی حەفتا کەسیی کە قورڕایان پێ ئەوتن نـارد بۆ لای قەومێکی موشریك کـە لـە بەینی ئەوانو لە بەینی پێغەمەرا ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەهدبوو ، غەدریـان کردو قورڕاکانیـان شەهید کرد • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تـا مانگێ قونووتی خوێندو دۆعای لێ ئەکردن •

[ مەعنای ( دون أولائك )م بۆ رێناکەوێ چونکی ( مشار إليه ) دیار نیە • قەسطەلانیی شتێك ئەفەرموێ لە عیبارەتەوە دوورەو هیچ تێی ناگەم • ئەوی ئیضاحی بکا خوا سەلامەتی بکا • ]

٢١٥٧/٤٥ ـ عن أنس ـ رضي الله تعـالى عنه ـ قال : كان القنوت في المغرب والفجر • ح ـ ٢٢٤/٢ •

قونووت له مەغریبو فەجرا بوه ٠

وعنه قال : بعث النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سـبعين رجلاً ، لحاجة ، يقـال لهم : القراء ٠ فعرض لهم حيان من بني سُـليم : رِعل ، وذكوان عند بئر يقال لها : بئر معونة ٠ فقال القوم : والله ما إياكم أردنا إنما نحن مجتازون في حاجـة للنبي ـ صـلى الله تعـالى عليه وســلم ـ فقتلوهم [ إلا كعب بن زيد ـ رضـي الله تعـالى عنـه ـ تركـوه وبه رمق فعاش حتى استشهد يوم الخندق ] فدعا النبي ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ عليهم شهراً في صلاة الغداة ، وذلك بدء القنوت وما كنا نقنت ٠ ح ـ ٦/٣٠٣ ٠

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆ فرمانێ حەفتا کەسی نارد کە قورڕایان پێ ئەوتن ٠ دوو طایفه له بەنی سولەیم رێیان پێ گرتن ، فەرموویان : وەڵلاهــــــی مەقصوودمان ئێوه نیه رێبوارین بۆ فرماتێکی پێغەمەر ـ صــلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەچین ٠ شەهیدیان کردن =کەعبی کوڕی زەید نەبێ بــــه برینداریی هێشتیانەوه ، دوایی ژییا تا له غەزای خەندەقدا شەهید وو = پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مانگێ له نوێژی ســــبەینێدا دۆعای لێ کردن ، ئەوه ئەوەڵی قونووته لەوەپێش قونووتمان نەئەخوێند ٠

٤٦/٢١٥٨ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رعـلا ، وذكوان ، وعصية ، وبني لحيان استمدوا رســول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ على عدو فأمدهم بسبعين من الأنصار كنا نسميهم : القراء في زمانهم ، كانوا يحتطبون بالنهار ويصلون بالليل ، حتى كانوا ببئر معونة قتلوهم وغـدروا بهم ! فبلغ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ذلك فقنت شـهراً يدعو في الصبح على أحياء من أحياء العرب على : رعل ، وذكوان ، وعصية ، وبني

لحيان • قال أنس [ رضي الله تعالى عنه ] : فقرأنا فيهم قرآناً ثم إن ذلك رفع • ( بلغوا عنا قومنا : أنا قد لقينا ربنا فرضي عنا وأرضانا ) • ح – ٦/٣٠٣ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ــ رضـــــي الله تعالى عنه ــ ئەفەرموێ : ريعــــلو ذەكوانو عەصييەو بەنیلەحيان بۆ سەر دوشمنێ طەڵەبی ئیمدادیان لە پێغەمەر ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ کرد • پێغەمەر ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ بــە حەفتا کەس لە ئەنصـــار ئیمدادی بۆ ناردن کـــە ئێمە بەوانەمان ئەوت : قورڕاء ؛ لە زەمانی خۆیانا قیرائەتیان زۆر بوو ، بــە ڕۆژ ئەچوون داریان ئەکێشا بە شەو نوێژیان ئەکرد • ڕۆیین تا گەینیە بیری مەعوونە ، هەموویان شەهیدکردنو غەدریان لێ کردن ! ئەو خەبەرە بە پێغەمەر ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ گەیی پێغەمەر ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ مانگێ قونووتی خوێند لە سبەینێدا دۆعای لە چەند طائیفەیێ لە طائیفەی عەرەب ئەکرد ، لەسەر ریعلو ذەکوانو عوصەییەو بەنی لەحیان • ئەنەس ــ رضي الله تعالی عنه ــ ئەفەرموێ : دەرحەق ئەوانە قورئانمان خوێند ، لە پاشا ئەو قورئانە هەڵگیررا : لە ئێمەوە خەبەر بدەن بــە قەومەکەمان کــە ئێمە گەیین بــە خذمەتی خوا ، لێمان رازیی بوو ئێمەیشی لە خۆی رازیی کرد •

٤٧/٢١٥٩ ــ سالم بن عبدالله [ رضي الله تعــالى عنه ] يقــول : كــان رسول الله ــ صلى الله تعالى عليه وسلم ــ [ لما جرح في أحــد ] يدعو على : صفوان بن أمية : وسهيل بن عمرو ، والحرث بن هشــام فنزلت ( ليس لك من الأمر شيىء •• الى قوله : فإنهم ظالمون )[1] [ فأسلموا يــوم الفتح ] • ح – ٦/٢٩٢ •

(١) آل عمران/١٢٨ •

٢١٦٠/٤٨ ـ عن سالم عن أبيه [ عبدالله ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] أنه سمع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا رفع رأســه من الركوع من الركعة الآخرة من الفجر يقول : أللهم العن فلانـاً وفلانـا [ صــــفوان وسهيلاً وحرثا ] بعد ما يقول سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد . فأنزل الله [ عز وجل ] : ( ليس لك من الأمر شيىء ... الى قوله : فإنهم ظالمون )

ح ـ ٦/٢٩٢ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە غەزای ئوحودا لە دوای ( سمع الله لمن حمده ) دۆعای لە : صەفوانی کوڕی ئومەییەو ، سوهەیلی کوڕی عەمرو ، حەرثی کوڕی هیشام ئەکرد . [ رضــي الله تعالى عنهم ـ چونکی لە فەتحا موسوڵمان بوون ] ئایەتی ( ليس لك )نازڵ بوو یەعنی : تۆ هیچت بە دەستنیە لە عەذابو عەفوی ئەوان ، یا خوا تەوبەیان لـــێ قەبووڵ ئەکا یا ئەگەر بە کافریی بمرن ظاڵمنو خوا عەذابیان ئەدا . یەعنی وەظیفەی تۆ دۆعا لەخەڵق‌کردن نیە ، وەظیفەی تۆ هەر تەبلیغی ئەوامیرو نەواهی‌یە . ئەم حەدیثە مورسەلە .

٢١٦١/٤٩ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قــال : لأُقرِّبَنَّ صلاة النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فكان أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقنت في الركعة الأخرى من صلاة الظهر وصلاة العشاء وصلاة الصبح بعـد مـايقـول ســمع الله لمن حمده ، فيدعو للمؤمنين ويلعن الكفــار .

ح ـ ٢/١٠٣ . م ـ ٣/٢٨٣ . د ، ن في الصلاة .

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضـــي الله تعـالی عنـــه ـ ئەفەرموێ : نوێژی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ئێوە نزیك ئەخەمەوە [ یەعنی ئەو چۆن نوێژی کردوە وا نوێژتان بۆ ئەکەم ] ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالی عنه ـ خۆی لە نوێژی نیوەڕۆو عیشاو سبەینیانا ، لە دوای ( سمع الله لمن حمده )وەوە لە رکاتی ئاخرییدا قونووتی ئەخوێن . دۆعای بـــۆ موسوڵمانان ئەکردو لەعنی لە کافران ئەکرد .

[ ئەمما ناوی کەسی نەئەبرد ؛ چونکی نەهی لێ‌کراوە ، کافرو موئمین هەر خوا ئەیزانێ کە کێن .]

٢١٦٢/٥٠ ـ قال أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : وكان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حين يرفع رأسه يقول : سمع الله لمن حمده ربنـا ولك الحمد ، يدعو لرجـال فيسـميهم بأسـمائهم فيقول : أللهم انج الوليد ابن الوليد [ أخو خالد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] وسلمة بن هشـام [ رضي الله تعالى عنه ـ أخو أبي جهل ـ لعنه الله تعالى ] وعيـاش [ رضـي الله تعالى عنه ] ابن أبي ربيعة [ أخا أبي جهـل ـ لعنـه الله تعـالى ـ لأمـه ] والمستضعفين من المؤمنين . أللهم أشدد وطأتك على مضر ، واجعلهـا عليهم سنين كسنيّ يوسـف ، وأهل المشـرق يومئـذ من مضـر مخالفون له .

ح ـ ٢/١٠٧ . د ، ن .

٢١٦٣/٥١ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : كان رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول حين يفرغ من صلاة الفجر من القراءة ويكبر ويرفع رأسه : سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد . ثم يقول ، وهو قائم : أللهم أنج الوليد بن الوليد ، وسلمة بن هشام ، وعياش بن أبي ربيعة والمستضعفين من المؤمنين . أللهم اشدد وطأتك على مضر واجعلها عليهم سنين

کسني يوسف . أللهم العن لحيان ، ورعلا ، وذكوان ، وعصية عصت الله ورسوله ، ثم بلغنا أنه ترك ذلك لما أنزلت ( ليس لك من الأمر شـــيء أو يتوب عليهم أو يعذبهم فإنهم ظالمون ) م ـ ٣/٣٨٢ .

وفي أخرى : ثم رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تـرك الدعاء [ عليهم ] بعد . فقلت : أرى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قد ترك الدعاء لهم . قال : فقيل : وما تراهم قد قدموا ؟ م ـ ٣/٣٨٣ .

**تەرجەمە :**

( ئەوەندە بەسە لەم بابەدا ) ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە وەختەدا کە سەری لە ڕوکووع بەرزئەکردەوە ئەیفەرموو : ( سمع الله لمن حمده ربنا ولـك الحمد ) دۆعای بۆ بەعزێ لە پیاوانی موسوڵمانان ئەکرد ، بە ناوی خۆیان ناوی ئەبردن ، ئەیفەرموو : خوایا نەجاتی وەلیدی کوڕی وەلیدی برای خالیدی بنی وەلیدو ، ســـەلەمەی کوڕی هیشـــامی برای ئەبوجەهلو ، عەییاشی برای دایکیی ئەبوجەهلو ، موسوڵمانانی ضەعیف کە لە مەککەدا ماونەوەو هیجرەتیان پێ‌نەکراوە بدە لە دەست کوففاری قورەیش . خوایا شێلاننت [ یەعنی عەذابو عوقووبەتت ] لە سەر موضەر بەشیددەت بکەو بیکە بە قاتیێ لێیان وەك قاتێتی یوسفی صددیق ـ عليه السلام ـ ئەهلی مەشریق لە موضەر لەو ڕۆژەدا موخالیفی پێغەمەر بوون ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ .

لە حەدیثەکەی موسلیما لە دوای ( کسني يوسف ) ـ عليه السلام ـ ئەفەرموێ : خوایا لەحیانو ، ذەکوانو ریعلو عوصـــەییە کە لە خوا ـ عزوجل ـەو پێغەمەری عاصي بوون .. بە لەعنەت بکە . لە پاشا کە ئایەتی ( ليس لك .. )إلخ نازڵ بوو تەرکی دۆعای لە کافران کرد .

لە حەدیثە ســێیەمەکەدا ئەبوهورەیرە ـ رضـــي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : وتم : وا ئەبینم کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم تەرکی دۆعای بۆ موســوڵمانانیش کرد • پێیانفەرمووم : بۆچی نابینی کە ئەوان هاتوون بۆ مەدینەو هیجرەتیان کردوە ؟ [ یەعنی ئیتر دۆعـای هیجرەتو نەجاتیان قەبوول کراوە ] •

لە نوێژا دۆعاکردن بۆ بەعزێ موسوڵمانو ناوبردنیانو دۆعاکردن لە کافرانو ناوبردنیان دروستە ، نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە •

دەلیلێ قونووت ئەم حەدیثانەیە • لای ئیمامی شــافیعی لــە نوێژی سبەینێدا بە دەوام سوننەتە • لە غەیری نوێژی سبەینانا سێ قەولی هەیە • قەولی مەشـــــهووری بۆ ( نازلة ) وەك : دوشمنو نەخۆشیی عومومیی سوننەتە لە هەموو نوێژێکا • قەولی دوەمی نازیلە بێ یا نەبێ قونــووت دروستەو ئەخوێنرێ • قەولی سێیەمی نازیلە بێو نەبێ لە غەیری سبەینانا ناخوێنرێ •

جێی قونووت لە ئیعتیدالی رکاتی ئاخریدایە ، بە جەهر ئەخوێنرێ ، سوننەتە دەستی بۆ بەرزبکرێتەوە وەك بۆ دۆعا • هەر دۆعایێ بخوێنرێ ئەبێ • سوننەتە ( أللهم اهدني ••• إلخ ) بخوێنرێ •

ئەبوحەنیفەو ئەحمەدو بەعزێ عولەمای تر ـ رحمهم الله ـ ئەڵێن : لە هیچ نوێژێکا قونووت نیە • مالیك ئەفەرموێ : لە پێش روکوعــــــدا ئەخوێنرێ • نەوەویی ئەفەرموێ : لە شەرحی موهەذذەبا ئیضاحم کردوە•

( تم أحاديث القنوت ولله الحمد ) •

ئەمجا لە ئەرکانی صەلات ( تشهد )و دانیشــــتن بۆ ( تشهد )و صەلەوات لە سەر پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو ئالیو سەلام ماوە ( فنقول مستعينا بالله ) •

# صیفەتی صەلات ـ تەشەهود

١/٢١٦٤ ـ عبدالله بن عبدالله أخبر أنـه كـان يـرى عبدالله بن عمـر [ أباه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] يتربع في الصلاة إذا جلس ففعلته وأنا يومئذ حديث السن ، فنهاني عبدالله بن عمر [ رضي الله تعالى عنه ] وقـال : إنما سنة الصلاة أن تنصب رجلك اليمنى وتثني [ تعطف ] اليسـرى • فقلت : إنك تفعل ذلك ، فقال : إن رجليّ لا تحملاني • ح ـ ٢/١٢٠ • د ، ن •

[ وعند مالك في موطئه : أن القاسـم بن محمد أراهم الجلوس في التشهد ، فنصب رجله اليمنى وثنى اليسرى ، وجلس على وركـه اليسرى ، ولم يجلس على قدمه • قسطلاني ] •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : باوکم دی لە تەحییاتی [ ئەخیرا ] چوارمەشقیی دائەنیشـت منیش وامکرد ، لەو رۆژانەدا من جەهێڵ بووم ، عەبدوڵڵای باوکم نەهی کردم فەرمووی : سوننەت وایە پێی راستت هەڵنێی پێی چەپت مەیلی پێ بکەی [ بۆ راستت ] عەرزمکرد : تۆ وا ئەکەی ؟ فەرمووی : پێی من من هەڵناگرێ •

خذمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرموویان : لە طەرەف هەموومانەوە سەلامی لێبکە ئەو دوو رکات نوێژی دوای عەصـــرەی لێ بپرسە • عەرزی بکە ئێمە خەبەرمان دراوەتێ کـە تۆ ئەیکەی ، وایشمان پێگەییوە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ نەهی لێکردوە • ئیبنوعەباس ـ رضــي الله تعــالى عنهما ـ فەرمووی : من لـەگـەڵ ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەسەر کردنی دوو رکـــاتی دوای نوێژی عەصر لە خەڵقم ئەدا کە نەیکەن •

کورەیب ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : چوومـە خـذمـەت حـەزرەتی عایشـــە ، ئەوە کە منیان بۆ ناردبوو عەرزمکرد ، فەرمووی : بچۆرە لای ئومموسەلەمە لێی بپرسە • لە خذمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعــالى عنها ـ هاتمەدەرێو چوومەوە خذمەت ئەوان ، قسەکەی حەزرەتی عایشــە ـ رضي الله تعالى عنها ـ م عەرزکردن ، چۆنیان ناردم بۆ خذمەت حەزرەتی عایشە وایش ناردمیان بۆ خذمەت حەزرەتی ئوممومسەلەمە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئوممومســـەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : لە پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بیست نەهی لێئەکرد ، لە پاشا دیم کە نوێژی عەصری کرد ئەو دوو رکاتەی کرد [ یەعنی ] لە پاش نوێژی عەصر هـاتـەماڵەوە لام ئەمجا ئەو دوو رکاتەی = کرد = چەند ژنێکم لە بەنی حەرام لە ئەنصار لە لا بوو ، جاریەکەم راسپاردە خذمەتی ، پێموت : لە تەنیشتیەوە بوەستە عەرزی بکە : کە ئوممومسەلەمە عەرزت ئەکا : ( یا رسول الله ) من لێمبیستی کە تۆ نەهیت لەو دوو رکاتە کرد ، کەچی ئەتبینم کـە تۆ خۆت ئەیکەی • ئەگەر بە دەستی موبارەکی ئیشارەتی کردی لێیبچۆرە دواوە • جاریەکە وای کرد بە دەستی موبارەکی ئیشارەتی فەرموو ، جاریەکە لێیچوە دواوە ، کە سەلامی دایەوە فەرمووی : ئەی کچی ئیبنی ئومەییـە

لەو دوو رکاتی دوای نوێژی عەصـــرە ئەپرسی ؟ ئەوە بەعزێ خەڵق لـــە عەبدولقەیس [ لـــە طەرەف قەومەکەیانەوە بـە فروســـــــتادەیی بـۆ ئیسلامبوونیان • أخری ] هاتنەلام مەشغووڵیان‌کردم لە دوو رکاتی دوای نیوەڕۆ ، ئەم دوو رکاتە کە لە دوای عەصر کردم ئەو دوو رکاتەیە •

نوێژی سونەت لە ئەوقاتی مەکرووهەیشا بێ بەقەزا ئەگێڕێتەوە ، ( خلافاً لأبي حنيفة ، وهذا حجة عليهم ) •

**صـــلاة الاســتخارة :**

٢٤٥٦/٨١ ـ عن جابر بن عبدالله [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : كـان رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يعلمنا الإستخارة في الأمور كما يعلمنا السورة من القرآن • يقول : إذا هم أحدكم بالأمر فليركع ركعتين من غير الفريضة •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ چۆن سوورەتێ لە قورئانی فێرئەکردین لە هەموو ئیشـێکا ، گەورە یا بوچووك ، کەم یا زۆر نوێژی ئیستیخارەو دۆعای ئیستیخارەی فێرئەکردین ، ئەیفەرموو : کە یەکێ لە ئێوە ئیرادەی کرد ئیشێ بکا کـــە نەزانێ کردنی باشــــە یا نەکردنی ، غەیری فەرز دوو رکـات نوێـژ بکـا ( ثم ليقل ) : لە پاشا بڵێ ( أللهم ) : خوایا : ( إني ) : من ( اســـــتخيرك بعلمك ) بە واســـیطەی عیلمی تۆوە طەلەبی ئەوەت لێ ئەکەم تێم‌بگەیێنی کە ئەم ئیشـــەی من تەمامە بیکەم خێر لـە کردنیایە یـا لـە نەکردنیایە • ( واستقدرك بقدرتك ) : بە واسیطەی قودرەتی تۆوە طەلەبت لێ ئەکەم کە

قودرەتم بدەی بەسەر کردنیا ( وأسألك من فضلك العظيم ) : لە فەضـڵو کەرەمی گەورەی تۆ طەلەبت لێ ئەکەم [ یەعنی هیچ کـەس حەقی ئەوەی بەسەر تۆوە نیە کە هیچ نیعمەتێکی پێعەطا بکەی ئەگەر عەطای بفەرمووی لە فەضڵو رەحمەتی خۆتەوەیە بە ئیستیحقاق نیە ] ( فإنك تقدر ولا أقدر ): بۆیێکت لێ طەلەب ئەکەم چونکی تۆ قودرەتت هەیەو من نیمە • ( وتعـلم ولا أعلم ) : بۆیە طەلەبی ئەوەت لێ ئەکەم کە لە کردنو نەکردنی کامی خێرە تێمبگەیێنی ؛ چونکی تۆ عیلمت هەیە بەمە کە چ لایێکی چاکەو من عیلمم نیە ( وأنت علام الغیوب ) : تۆ لە هەموو کەس عالمتری بەوە کـە لـە ئێمە پەنهانە ( أللهم ) : خوایا ( إن کنت تعـلم ) : ئەگەر لـە عیلمی ئەزەلی تۆدا وایە • ( أن ) : کە ( هذا الأمر ) : ئەم ئیشە ( خیر لي في دیني ومعـاشـي وعاقبة أمري ) : لە دینماو لە مەعاشماو لە ئاخری کارما خێرە بۆم ( أو قال : عاجل أمري وآجله ) یا فەرمووی : لە ئیشی موعەججەلماو لە ئیشـــــی موئەججەلما • راویی شکی بوە لە لەفظی پێغەمەرا ـ صـلی الله تعـالی علیە وسلم ـ کە لەم دوو لەفظە کامی فەرموە • ( فاقدُره لي ) : بۆم موقەددەر بکە ( ویسره لي ) : بۆم ئاسان بکە ( ثم ) : لە پاشـــا ( بارك لي فیه ) : بەرەکەتم بۆ تێبخە ( وإن کنت تعلم ) : ئەگەر لە عیلمی ئەزەلی تۆدا وایـە ( أن ) : کە ( هذا الأمر ) : ئەم ئیشـــە ( شر لي في دیني ومعاشي وعاقبـة أمري ) : لە دینماو لە مەعیشەتماو لە ئاخری کارما شەڕە بۆم ( أو قال في عاجل أمري وآجله ) : یا ئەم دوو لەفظەی فەرموو ( فاصرفه عني ) : ئـەم ئیشەم لێلادە ( واصرفني ) : منیش لادە ( عنه ) لە کردنی ئەم ئیشـــەو لە دڵمی بێنەرە دەرێ ( واقدر لي الخیر حیث کان ) : خێر لە هەر کامێکیا بێ لە کردنا یا لە نەکردنا ئەوەم بۆ موقەددەر بکە • ( ثم ) : لە پاش تەقدیری ( أرضني بـه ) بەوەی کـە موقەددەرت کردوە بۆم رازیم بکە ( قـال ) :

فەرمووی ( ويسمي حاجته ) : لـە بەینی دۆعاکەیـا ئیحتیاجی‌یەکەی چیـە ناوی ببا • ح ـ ۳۱۸/۲ • د ، ت ، جە ، ن • خ ـ ۲۰٦/۹ ، خ ـ ۱۰/۳٦۱ •

سێ شەممە ۱۹٤۱/٦/۳ تم ولله الحمد

چونکی راویی شکی بوە لە لەفظی پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بۆ خاتری ئەمە کە لێی یەقین بێ کە فەرموودەکەی ئەوی وتـوە سێ دەفعە دۆعاکە تکرار بکاتەوە ، جارێ بڵێ : ( في ديني ومعاشي وعاقبة أمري ) جارێ بڵێ : ( في عاجلي وآجلي ) جارێ بڵێ : ( في ديني وعاجلي وآجلي ) لە ئەووەڵی دۆعاکەدا حەمدو صـــەلاتو سـەلام بکا • حەوت دەفعەیش ئیستیخارە بکا •

( تم النوافل بعون الله تعالى ) • سێ شەممە ۱۹٤۱/٦/۳ •

( الحمد لله ) بەحثی نوێژی دائیمیی بـــە ئەرکانو شـــــــەرتو شورووتی‌یەوە تەواو بوو ، فەقەط چۆن ئینسان ســـاغ ئەبێو نەخۆش ئەبێو ، نەخۆش بەعزێکی بە تەداویی چاك ئەبێتەوەو ئەچێتەوە ســـــەر حاڵی پێشووی ، بەعزێ نەخۆشیش چاك ئەبێتەوە ئەمما دەردەژێو زەردو زەعیف ئـەبێ ، بـەعـزێ نـەخۆشیش قابیلی تەداوی نیـە پێی ئەمرێ •• نوێژیش بەعزێ حاڵی بە سەرا یێ مانیعی کەماڵی ئەبێ فەقەط دەوای هەیە بە سوجدەی سەهو ئەچێتەوە حەددی کـەمال ، بەعزێکی خەلەل بـە ئەوابی ئەگەیێنێ بە نوقصانی ئەمێنێتەوە وەك ئیرتیکابی مەکرووهـ • بـەعزێکی نوێژەکە ئەمرێنێ وەك ( مبطلات ) • ئیستە ( بعون الله ) دەست ئەکەم بـە ئەحادیثی دائیر بەو سێ نەوعە نەخۆشی‌یەی نوێژو ئیجتیناب لە ئەسبابی‌و دەوای ، لە پێشا دەست بە ئەحادیثی دائیر بە سەهو ئەکەم • ( فنقول ومن الله التوفيق ) •

# باب سجود السهو

((( بسم الله الرحمن الرحيم )))

الحمد لله رب العالمين

عمران بن حصين [ رضي الله تعالى عنه ] وكان مبسورا قال : سـألت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن صلاة الرجل قاعداً ، فقال : إن صلى قائماً فهو أفضل ، ومن صلى قاعداً فله نصف أجر القائم ، ومن صلى نائماً فله نصف أجر القاعد . ح- ٢/٢٩١ ، ٢٩٢ . د ، ت ، ن ، جه[1] .

چوار شەممە ١٩٤١/٦/٤

---

(١) دانەر ـ خ ـ دوای ئەوەی سەرەتای باسی سوجدەی سەهوی نووسی ، بێ ئەوەی ژمارەی بۆ دابنێ ، ئەم حەدیثەی نووسیوە ، لە خوارییەوە ئەندازەیەك كاغەزی بـــە سـپێتی بۆ بڕداوە ، ئیتر نـە تەرجەمەی نووسیوەو ، نە هیچیشی نووسیوە . ئەمە تەرجەمەكەیەتی :

عیمرانی كوڕی حوصـەین ـ خ ـ نەخۆشیی مەیاسـیریی بوو ، ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـم پرسـیی دەربارەی پیاو كە بە دانیشتنەوە نوێژ بكا ، فەرمووی : ئەگەر بە پێوە نوێژی كرد ئەوە چاكترە ، ئەگەر بـە دانیشتنەوە نوێژی كـرد ئـەوە نیوەی خێری ئەوەی هەیە كە بە پێوە بیكا ، ئەگەر بە پاڵكەوتنەوە بیكا ئەوە نیوەی خێری ئەوەی هەیە كە بە دانیشتنەوە بكرێ .

١/٢٤٥٧ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إن أحدكم إذا قام يصلي جاءه الشيطان فلَبَس عليه حتى لا يدري كم صلى ، فإذا وجد ذلك أحدكم فليســـجد سجدتين وهو جالس • ح ـ ٣٥٤/٢ • م ـ ٢٤٠/٣ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : كە یەكێكتان بـۆ نوێژ هەڵسا شەیتان یێتە لای لێی ئەشێوێنێ تـا نازانێ چەندەی كردوە • كە ئەوەی بوو بە دانیشتنەوە دوو سوجدە بەرێ •

٢/٢٤٥٨ ـ وعنه أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قـال : إذا نودي بالأذان أدبر الشيطان وله ضراط حتى لا يسمع الأذان ، فإذا قضي الأذان أقبل ، فإذا ثوب بها أدبر ، [ فإذا سكت رجع فوسوس • م ـ ٤٧٣/٢ ] فإذا قضي التثويب أقبل حتى يخطر بين المرء ونفسه ، يقول : اذكر كـذا ، اذكر كذا لما لم يكن يذكر [ فهناه ومناه ، وذكره من حاجاتـه ما لـم يكن يذكر • م أخرى ] حتى يظل الرجل إن يدري كم صلى ، فإذا لم يدر أحدكم كم صـــلى [ ثلاثـاً أو أربعـاً • خ ] فليســجد ســـجدتين وهو جالس • ح ـ ٣٥٣/٢ ، م ـ ٢٤٠/٣ • د ، ن •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ فەرمووی : كـــە بانگدرا شەیتان پشت هەڵەكاو ئەترێ تا غایەتێ كە دەنگی بانگ نەبێ ، كە لە بانگ بۆوە دووبارە ئێتەوە ، كە قامەتكرا پشت هەڵەكا ، كە قامەت تەواو بوو یێتەوە ئەكەوێتە بەینی پیاوو نەفسیەوە [ ئەبێ بە حائیل لە بەینی ئینسانو

شوعووریا ، ئەیخاتە وەسوەسەوە ] پێی ئەڵێ : فکر لەوە بکەرەوە ، فکر لەوە بکەرەوە ، بۆ ئەو شتانەی کە بە دڵیا نەئەهات ، تا پیاو وای لێ یێ کە نازانێ چەندەی نوێژکردوە . کە نەیزانی چەندەی کردوە بە دانیشـــتنەوە دوو سوجدە ببا .

موراد لە ( ضراط ) ئەگونجێ حەقیقەت بێ ، ئێمە وەك خۆی نابینین ئەوەیش نابیەین . ئەگونجێ مەجاز بێ لـە دوورکەوتنەوەی لـە موئەذذین تا گوێی لە دەنگی نەبێ ، وەك لە موسلیما ئەفەرموێ لە جابیرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : شەیتان کە گوێی لە دەنگی بانگ بوو تا رەوحا ئەڕوا . سولەیمان کە ئەعمەشـە ئەڵێ لە ئەبوسوفیانم پرسی رەوحا کوێیە ؟ فەرمووی : سیوشەش میلە لە مەدینەوە . لە بەحثی بانگا[1] رابورد .

٢٤٥٩/٣ ـ عن عبدالله بن بجينة ـ رضي الله تعالى عنـه ـ حليف بني عبدالمطلب أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قام في صلاة الظهر وعليه جلوس ، فلما أتم صلاته سجد سجدتين يكبر في كل ســـجدة وهو جالس قبل أن يسلم ، وسجدهما الناس معه مكان ما نســـي من الجلوس [ ثم سلم . أخرى . خ ] م ـ ٣/٢٤١ ، ٢٤٢ . ح ـ ٢/٣٤٩ ، ٣٥٣ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە نوێژی نیوەڕۆدا لە رکاتی دوەما بۆ تەحییات دانەنیشت تەشریفی هەڵسایەوە ، کە نوێژەکەی تەواوکرد دوو سوجدەی لە پێش ســـەلاما برد ، بـە دانیشـــتنەوە ، لەگەڵ کوللی

(١) نزیك بەم حەدیثە لە باسی بانگدا حەدیثی ( ١٤/٢٠٥٨ )ە .

سەجدەیێکیدا ( ألله أكبر )ی ئەکرد ، خەڵقیش لەگەڵ ئەوا ســوجدەیان برد ، لە باتی ئەو دانیشتنەوە کە لە فکری چوو ، لە پاشا سەلامی دایەوە •

دەلیلی ئیمامی شافیعی‌یە ـ رضي الله تعالى عنه ـ •

٢٤٦٠/٤ ـ عن أبي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إذا شك أحدكم في الصـلاة فلم يدر كم صلى : ثلاثاً ، أم أربعاً، فليطرح الشك ، وليبْن على ما اسـتيقن ، ثم يسجد سجدتين قبل أن يسلم ؛ فإن كان صلى خمساً شـفعن له صلاته ، وإن كان صلى إتماماً لأربع كانتا ترغيماً للشيطان • م ـ ٢٤٤/٣ •

**تەرجەمە :**

ئەبوسەعیدی خودریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمـەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فەرمووی : کە یەکێکتان بەشك‌کەوت لە نوێژا ، نەیزانی چەند رکـاتی کردوە : ســـــیانی کردوە ، یـا چواری کردوە •• شکەکەی فڕێ بدا ، کامی یەقینە لە لای لەســــەر ئەوە بینای نوێژەکەی بکاتەوە [ یەعنی لێرەدا بڵێ : سێ رکاتم کردوە ، رکاتێکی تر بکا ] لە پاشا دوو سوجدە ببا لە پێش ئەمەدا کە سەلام بداتەوە ، ئەگەر [ چوار رکاتی کردبێ بەم رکاتەوە ، یەعنی ] پێنج رکاتی کردبێ ئەم دوو ســــوجدەیـە نوێژەکەی ئەکەن بە جووت [ یەعنی ئەبێ بە شەش ] ئەگەر [ سێ رکـاتی کردبێ ] ئەم رکاتەی کە ئەیکا تەواوکردنی چوار رکاتەکەی بێ [ زیـادەی نەبێ ] دوو ســـوجدەکەی بە کوێرایی شـــەیتان ئەبێ ، لووتی شەیتانی پێ‌ئەکەوێتە سەر ئەرز •

سوجدەی سەهو بۆ زیادیش‌و بۆ کەمیش ئەبێ ، لە پێش ســـەلاما ئەبێ ، تەحییاتی پێ ناوێ ( خلافاً للحنفية فيهما )[1] •

٥/٢٤٦١ ـ عن إبراهيم النخعي عـن علقمة ، قـــال : قـــال عبـدالله [ بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] : صلى النبي ـ صلى الله تعـالى عليه وســــلم ـ قـال إبراهيـم : لا أدري زاد أو نقص [ قـــال ابراهيـم : والوهم مني ] • فلما ســـلم قيـل لـــه : يـا رســـول الله أحـدث في الصلاة شيء ؟ قال : وما ذاك ؟ قالوا : صـــليت كـذا وكـذا ، فثنى رجله واستقبل القبلة وسجد سجدتين ، ثم سلم ، فلما أقبل علينا بوجهه قال : إنه لو حدث في الصلاة شيء لنبأتكم = بـه = ، ولكن إنما أنا بشر مثلـكم ، أنسى كما تنسون ، فإذا نسيت فذكروني • وإذا شك أحدكم في صـــلاته فليتحر الصواب ، فليتم عليه ، ثم يسلم ، ثم يسجد سجدتين • ح ـ ١/٤٠٨ م ـ ٣/٢٤٨ •

٦/٢٤٦٢ ـ عن عبدالله [ بن مسعود ] ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلى الظهر خمساً ، فقيل لـه : أزيـد في الصلاة ؟ فقال : وما ذاك ؟ قال : صليت خمساً ، فسجد سجدتين بعد ما سلم• ح ـ ٢/٣٤٩ • م ـ ٣/٢٤٩ • وفي أخرى : فلما انفتل تشـــوش القوم بينهم ، فقال : ما شأنكم ؟ قالوا : = يا رسول الله = هل زيد في الصـلاة ؟ قال : لا • قالوا : فإنك قد صليت خمساً • فانفتل ، ثم ســـجد سجدتين ، ثم سلم • ثم قال : إنما أنا بشر مثلكم أنسى كما تنسون ، فإذا نسي أحدكم فليسجد سجدتين • م ـ ٣/٢٥٠ •

(١) مەبەستی ئەوەیە بە لای ئەبو حەنیفەوە ـ خ ـ دوای سەلام سوجدەی سەهو ئەبرێتەو دوایی تەحییاتێکی تر دەخوێنرێت ، دوایی ســــەلام دەدرێتەوە .

٢٤٦٣/٧ ـ عن عبدالله [ بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] قـال : صلينا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ فإما زاد وإما نقص • قال إبراهيم : وأيم الله ! ما جاء ذاك إلا من قبلي = قال : قلنا : يا رسول الله أحدث في الصلاة شيء ؟ فقال : لا = فقلنا له الذي صنع • فقال : إذا زاد الرجل أو نقص فليسجد سجدتين • قال : ثم سجد سجدتين • م ـ٣/٢٥٢ •

٢٤٦٤/٨ ـ وعنه أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سـجد سجدتي السهو بعد السلام والكلام • م ـ ٣/٢٥٣ بەسە •

**تەرجەمە :**

چوار حەدیث لە ئیبنومەسعوودەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەمووی یەك حادیثەیە ، مەعنایان بەجارێ :

ئیبراهیمی نەخەعیی ـ رحمه الله تعالى ـ لـە عەلقەمەوە ئەویش لـە ئیبنومەسعوودەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکا کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێنج رکات نوێژی نیوەڕۆی کرد [ بە بێ شك ، لـە ریوایەتەکەی ترا ئیبراهیم بە شکەوە ئەفەرموێ : نازانم کـە = لـە = حەدیثەکەدا ئیبنومەسعوود یا فەرمووی ، زیادی ، یا فەرمووی کەمی کرد ، ئیبراهیم ئەفەرموێ : ئەم شکە لە منەوەیە لە عەلقەمەو ئیبنومەسعوودەوە نیـە ] کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سـەلامی دایەوە خەڵق موشەووەش بوون • سـەریان لێتێكچوو کـە نوێژ لێی زیادکراوە ، یا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سەهوی کردوە ؟ عەرزیانکرد : نوێژ لێی زیادکراوە ؟ فەرمووی : خەیر ، بۆ چی بوە ؟ عەرزیانکرد : تـۆ پێنج رکاتتکرد ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێی جووتکردو رووی کردەوە قیبلە دوو سوجدەی بردو سـەلامی دایەوە • کە رووی

موبارەکی وەرگێڕایە ئێمە فەرمووی : لە نوێژێ [ بـە وەحی ] زیادیێ یـا کەمێ ببێ خەبەرتان ئەدەمێ ئەمما من بەشەرم ، وەکو ئێوە سەهو ئەکەم ، وەکو ئێوە لەفکرم ئەچێتەوە • کە یەکێکتان لە نوێژا بەشك کەوت کـامی صەوابە فکری لێبکاتەوە [ لـە کەمیی ، لە زۆریی کامی هاتەوە فکری ] لەسەر ئەوەوە نوێژەکەی تەواو بکا لە دواییا سەلام بداتەوە ، لە پاشـــا سوجدەی سەهو بیا •

لە ریوایەتەکەی تریا : دووسوجدەی بردو لە پاشا سەلامی دایەوە • وەلحاصل لە ریوایەتێکا لە پێش سەلاما ، لە ریوایەتێکا لە دوای ســـەلام دوو ســـوجدەی برد ، لـە ریوایەتێکا لە دوای سوئالو جوابو ئەمر بە سوجدە سوجدەی سەهوی برد • ظاهیر وایە سوجدەی سەهوی لەپێش ئەم فەرمووانەی بووبێ • لە ریوایەتەکەی ترا کـە لـە دوای قســـەکردن سوجدەی برد مەعنای وایە کە ئیبنومەسعود ئەم دوو قسەیەی فەرموو • فەرمووی : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ قسەی فەرموو لەگـەڵ ئەصحابا ، فەرمویشی : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سوجدەی سەهوی برد لازم نایێ لەمەوە کە قسە فەرموونەکەی لە پێش سوجدەکەیا بووبێ ، لەگەڵ ریوایەتەکەی یەکێك ئەگرنەوە •

[ مەجبوور بووم بڵێم : ( ثم ) بۆ تەرتیبی ذیکرییە ، بـۆ تـەعقیبو تەراخیی نیە ، ئەمە لە هەموو زەمانێکا هەیە با ئەو ئیصطیلاحەیش نەبێ ] •

ســـوجدەی ســەهو پێش سەلام ئەبێ یا دوای سەلام ؟ هەردووکی هەیە ، تەحەڕڕی صـــەواب کـەی ئەبێو کـەی نابێ ؟ لە ( فقـه )ایە • نووي ـ ٣ ص٢٤٩ •

٩/٢٤٦٥ ـ عن عمران بن حصين [ رضي الله تعالى عنه ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلى العصر فسلم في ثلاث ركعات ، ثم دخل منزله ، فقام إليه رجل يقال له : الخرباق ، وكان في يديـه طول ، فقـــال : يا رسول الله .. فذكر لـه صنيعه ، وخرج غضبان يجر رداءه ، حتى انتهى إلى الناس ، فقال : أصدَقَ هذا ؟ قالوا : نعم . فصلى ركعة ، ثم سـلم ، ثم سجد سجدتين ، ثم سلم . م ـ ٣/٢٥٦ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی عەصری کرد ، لە سێ رکاتا سەلامی دایەوەو چوە ماڵەوە ، پیاوێکی خەرباق ناو ، دەستی نەختێ درێژ بوو لەبەر ئەوە پێیان ئەوت : ( ذو اليدين ) چـوە خذمـەتی عەرزی کرد = : ( یا رسول الله ) سێ رکاتت کرد ، لـە حوجرەی ســـەعادەت تەشریفی هاتەدەرێ ، بە غەضەبەوە بەرماڵەکەی رائەکێشـــا تـا تەشریفی هاتە ناو خەڵقەکەوە ، فەرمووی : ئەمە راست ئەکا [کە سێ رکاتم کردوە] ؟ عەرزیانکرد : بەڵێ . رکاتێکی تری کرد ، لە پاشا سەلامی دایەوە ، لە پاشا دوو سوجدەی برد ، لە پاشا سەلامی دایەوە . سەلامێ لە پێش سوجدەی سەهواو ، سەلامێ دوای سوجدەی سەهو .

١٠/٢٤٦٦ ـ ابن سيرين ـ رحمه الله ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صلى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إحـــدى صـــلاتي العشـيِّ ـ قال محمد : وأكثر ظني العصر ـ ركعتين ، ثم سلم ، ثم قـام إلى خشبة في مقدم المسجد [ معروضة في المسجد فاتكأ عليها كأنه غضبـــان ، ووضع يده اليمنى على اليسرى ، وشبك بين أصابعه ، ووضع خده الأيمن على ظهر كفه اليسرى ، وخرجت السَّرَعان من أبواب المسجد . وفي آخره :

فربما سألوه [ هل في الحديث ] ثم سلم فيقول : نبئت أن عمران بن حصين [ رضـي الله تعـالى عنـه ] قـال ثم سلم ] ح ـ ١/٤٥٠ • م ـ ٣/٢٥٣ • د ، ن ، جه • فوضـع يـده عليها ، وفيهم أبو بكر وعمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فهابا أن يكلماه ، وخرج سرعان = الناس = فقالوا : أقصـرت الصلاة ؟ ورجل يدعوه النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ ذو اليـديـن فقال : أنسيت أم قصرت ؟ فقـال : لم أنس ولم تُقْصر • قـال : بلى قـد نسيت • فصلى ركعتين ثم سلم ثم كبر ، فسـجد مثل سجوده أو أطول ، ثم رفع رأسه فكبر ، ثم وضع رأسه فكبر ، فسجد مثل سجوده أو أطول ، ثم رفع رأسه وكبر • ح ـ ٢/٣٥٢ • ح ـ ١/٤٥٠ وفيه زيادات لا تضر • وهي : قال ابن سيرين قد سماها = الصلاة التي وقـع فيهـا السـهو = أبو هريرة ولكن نسيت أنا ] •

١١/٢٤٦٧ ـ أبو هريرة [ رضـي الله تعـالى عنـه ] يقول : صلى لنـا رسـول الله ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ صـلاة العصـر فسـلم في ركعتين ، فقـام ذو اليـدين ، فقال : أقصـرت الصلاة يا رسول الله أم نسيت ؟ فقال رسـول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ : كل ذلك لم يكن • فقال : قد كان بعض ذلك يا رسول الله • فأقبل رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ على الناس ، فقـال أصَـدَقَ ذو اليدين ؟ فقالوا : نعم يا رسول الله • فأتم رسول الله ـ صـلى الله تعـالى عليه وسلم ـ ما بقي من الصلاة ، ثم سجد سـجدتين ، وهو جالس بعـد التسليم • م ـ ٣/٢٥٥ • ( ئيتر بەسە ) •

**تەرجەمە :**

ئیبنوســـیرین ـ رحمه الله ـ لـە ئەبوهورەیرەوە ریوایەت ئەکـا کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نوێژی عەصر یا نوێژی نیورِۆ ئەکا ، ئەبوهورەیرە بەیانی کرد کە کامیان بوو ئەمما من لـە فکرم چۆتەوە ، لام وایە کە نوێژی عەصر ئەبێ ، دوو رکات ئەکاو سـەلام ئەداتەوەو تەشریفی ئەچێ داریێ لای میحرابی مزگەوتەکەوە ئەبێ دەستی راستی ئەبێتە سـەر دەســـتی چەپی ، پەنجەی هەردوو دەستی لـە یـەك تێئەپەرێنێ ، رووی راستی موبارەکی لەسەر پشتی دەستی چەپی دائەنێ ، دەستی ئەخاتە سەر دارەکە ، لە ناو ئەهلی جەماعەتەکەدا پیاوی وەك ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر ـ رضـي الله تعـالی عنهما ـ بوو جەســـارەتیان نەکرد کـــە لـەو خوصووصەوە قسەیێکی لە خذمەتا بکەن ، ئەوانەی کە عەجەلەیان بوو لە دەرگاکـانی مزگەوتەوە چوونەدەرێ ، وتیـــان : نوێژکورتکراوەتەوە ، پیاوێکیان تیابوو خەرباق نـاو ، دەستی نەختێ درێژ بوو پێیــــان ئەوت ( ذو الیدین ) عەرزیکرد : ( یـا رســـول الله ) لـە فکرت چوو یـا نوێـژ کورتکراوەتەوە ؟ فەرمووی : ئەوانە هیچیان نەبوە ، نە لە فکرم چوو نە کورتکراوەتەوە ، عەرزیکردەوە : لەو دوانە یەکێکیان بوە ( یـا رسول الله ) پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رووی‌کردە ئەهلی جەماعەتەکە فەرمووی : ئایا وایە کە ( ذو الیدین ) ئەڵێ ؟ عەرزیانکرد : بەڵێ ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی چوە پێشێ ، نوێژەکەی تەواوکردو سەلامی دایەوە ، لە پاش سەلام ( الله أکبر )ی کرد ، وەك سوجدەکانی تر یا درێژتر لەوان سوجدەی برد ، سەری بەرزکردەوەو ( الله أکبر )ی کرد ، لـە پاشـــا ( الله أکبر )ی کردو وەك ســـوجدەکانی تری یـا درێژتر سوجدەیێکی برد .

لە ئیبنوسیرینیان پرسی : ئایا لە حەدیثەکەدا هەیە کە دووبارە سەلامی دایەوە ؟ ئیبنوسیرین فەرمووی : خەبـەرم دراوەتێ کـــە عیمرانی کوڕی حوصەین فەرمووی : لە پاش سوجدەکان ســـەلامی دایەوە • یەعنی دوو رکاتەکەی کردو سەلامی دایەوەو دوو سوجدەی وەك ســوجدەی نوێژی بردو دیسان سەلامی دایەوە • لە دوای ســـــوجدەی سەهوەکە تەحییاتی خوێند یا نەیخوێن ئەوەی تیا نیە •

تەماشای ئەم حەدیثانە بکەی سوجدەی سەهو دوای ســەلام‌و دوای کـەلامی زۆرو ، دوای رۆیین‌و گەڕانەوە بـۆ جێ‌نوێـژەکـەی‌و کـردنی ناتەواویی‌یەکەی‌و سەلامیش لەو ئەکرێ بە بێ تەحییات ، دووبارە ســـەلام ئەدرێتەوەو پێش سەلامدانەوە لە ئەصلی نوێژەکەیشیا ئەبرێ ، موحتاج نیە بە تەئویلی حەدیثەکان • فەقەط لە دوای ئەمە کە ( مطلع ) بوو بەمـە کـە سەهوی کردوە بۆی نیە هیچ شتێکی موناڧیی نوێژ بکا •

لە سوجدەی ســـەهو ئەم میقدارە بەسە دەست‌بکەین بـە موبطیل‌و مەکرووهـ •

**مەکرووهات‌و موبطیلات :**

١٢/٢٤٦٨ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه نهى أن يصلي الرجل مختصراً • م ـ ٣/٢١٥ •

١٣/٢٤٦٩ ـ عن معيقيب [ رضي الله تعـالى عنــه ] قـال : ذكر النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ المسح في المسجد ، يعني الحصى ، قال : إن كنت فاعلاً فواحدة • م ـ ٣/٢١٦ ، ح ـ ٢/٣٤٠ • د ، ت ، ن ، جه •

١٤/٢٤٧٠ ـ وفي أخرى عنه أنهم سألوا النبي ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ عن المسح في الصلاة ، فقال : واحدة • م ـ ٣/٢١٦ ، ح-٢/٣٤٠ •

١٥/٢٤٧١ ـ وعنه أيضاً أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال في الرجل يسوي التراب حيث يسجد ، قال : إن كنت فاعلاً فواحدة •
م ـ ٢١٦/٣ ، ح ـ ٣٤٠/٢ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەهی‌کردوە لەمە کە ئینسان دەست بخاتە کەلەکەیەوەو نوێژ بکا ( أبو هريرە ) • موعەيقيب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەریان پرسی ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆ رێخستنی وردەبەردو رێکخستنی ئەرز بۆجێ‌ســوجدەی فەرمووی : ئەگەر مەجبووریت بێ تەنها دەفعەیێ •

٤٦/٢٤٧٢[1] ـ عن أنس بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] وابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] وعائشة [ رضي الله تعالى عنها ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا قرّب العشاء وحضرت الصلاة فابدؤا به قبل أن تصلوا صلاة المغرب ، ولا تعجلوا عن عَشائكم •
م ـ ٢٢٥/٣ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بەرشـێوتان بۆ هێنراو نوێژیش حازربوو ، یەعنی قامەتی بۆ کرا ، لە پێش نوێژی مەغریبا شێو بکەنەوە ئەمجا نوێژەکەتان بکەن عەجەلە مەکەن [ بۆ نوێـژو ، پاش بکەون ] لە شێوکردنتان •

(١) دانەر ـ خ ـ بە هەڵە لە ژمارە ( ١٥ )وە چوە بۆ ژمارە ( ٤٦ ) •

٢٤٧٣/٤٧ ـ عن ابن أبي عتيق [ هو عبدالله بن محمد بن عبدالرحمن ابن أبي بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] قال : تحدثت أنا والقاسم [ بن محمد بن أبي بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] عنـد عائشـــة [ رضي الله تعالى عنها ] وكان القاسم رجلاً لحانة ، وكـان لأم ولد ، فقالت له عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] : ما لك لا تحدث كما يتحدث ابن [ أبن ] أخي ؟ أما أني قد علمت من أين أتيتَ هذا أدّبته أمه ، وأنت أدبتك أمك ، قال : فغضب القاسم وأضبَّ عليها [ حقدها ] فلما رأى مائدة عائشـــة [ رضي الله تعالى عنها ] قد أتي بها قام • قالت : أين ؟ قال : أصلي • قالت : اجلس • قال : إني أصلي • قالت : اجلس غُدَر [ يا غادر ] إني ســمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : لا صـلاة بحضرة طعـام ، ولا وهو يدافعه الأخبثان • م ـ ٣/٢٢٦ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵلای کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق ـ رضي الله تعالى عنهما ، ورحمهما ـ ئەفەرموێ : منو قاســمی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری صـــەدیق ـ رضـي الله تعـالى عنه ، ورحمهما ـ لە خدمت حەزرەتی عایشەدا ـ رضي الله تعالى عنها ـ قسـەمان ئەکرد ، قاسم لە ( أم الولد ) بوو = لە قسەکردندا تەواو نەبوو و زمـانی بەیەکدا دەهێنا = عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بە طەریقی نەصـیحەت پێی فەرموو : تۆ بۆچی وەك عەبدوڵلای برازام قسـە ناکەی ؟ ئەزانم لـە کێوە ئەم قســـەنەزانینەت بۆ هاتوە : ئەو دایکی تەربیەی داوە [ کـە حوڕڕەیەو ئەصیلەیە ] تۆیش دایکت تەربیـەی داوی [ کـە جاریەیە ] • قاسم لەوە رقی لێی هەڵسا ، کە چاوی کەوت بـەوە کـە سـفرەو خوانی

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ هات هەڵســا ، لێیپرسیی : بۆ کوێ ؟ عەرزیکرد : نوێژەکەم • فەرمووی : دانیشـــــە • عەرزیکرد : نوێژ ئەکەم • فەرمووی : غەددار دانیشە • من لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ م بیست ئەیفەرموو : نە کە طەعام حازربوو نوێژ ئەکرێ ، نە کە ئینسان ئیشی ســـەراوی هات نوێژ ئەکرێ ، یەعنی لەو دوو حاڵەتەدا مەکرووهە •

بۆ ئینسانی گەورە نەصیحەتی لەخۆبچووکترو تەکدیری دروستەو ، گوێ لێگرتنی لە دائیرەی ئەدەبا لازمە •

٢٤٧٤/٤٨ ـ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال في غزوة خيبر : من أكل من هذه الشجرة [ من هذه البقلة • أخرى ] يعني الثوم فـلا يأتين المســاجـد [ فلا يقـربن مسجدنا ] حتى يذهب ريحها ، يعني الثوم • م ـ ٣/٢٢٨ • وعن أنس نحوه ، وعن أبي هريرة : ولا يؤذينا بريح الثوم •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعومەرو ئەنەس‌و ئەبوهورەیرە ـ رضـي الله تعـالى عنهم ـ بـە عیبارەتی موتەقاریبە لە پێغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ریوایەت ئەکەن کە لە غەزای خەیبەرا فەرمووی هەرکەسێ لەم گیایە = واتە سیر = بخوا تـا بۆنەکەی ئەبڕێ نزیك بـە مزگەوتی ئێمە نـەکـەوێ‌و بـە بۆنی ئەذیەتمان نەدا •

٢٤٧٥/٤٩ ـ عن جابر [ رضي الله تعالى عنه ] قال : نهى رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن أكل البصل والكراث ، فغلبتنـا الحاجـة

فأكلنا منها ، فقال : من أكل من هذه الشجرة المنتنة فلا يقربن مسجدنا ، فإن الملائكة تأذى مما يتأذى منه الإنس [ بنو آدم ، أخرى ] .

٢٤٧٦/٥٠ ـ وفي رواية حرملة زعم [ أي قال ] : أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : من أكل ثوماً أو بصلاً فليعتزلنا ، أو ليعتزل مسجدنا ، وليقعد في بيته ، وأنه أتي بقدر [ ببدر ، خ ] فيه خضـــرات من بقول ، فوجد لها ريحا ، فسأل فأخبر بما فيها من البقول ، فقال : قربوها إلى بعض أصحابه ، فلما رآه كره أكلها .. قال : كل ، فإني أناجي من لا تناجي. م ـ ٣/٢٣٠ .

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ نەهیکرد لە خواردنی پیـازو کەوەر ، ئیحتیاجی غەڵەبەی لێکردین لێمانخوارد ، فەرمووی : هەرکەسێ لـەم درەختە بۆگەنە بخوا نزیکی مزگەوتی ئێمە نەکەوێ ؛ چونکە مەلائیکە لەوەی کـە بەنیئادەمی پێی موتەئەذذی ئەبێ موتەئەذذی ئەبێ . لە ریوایەتەکەی تریا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : هەرکەسێ سیر یا پیـاز بخوا لێمان جوێبێتەوە ، یا فەرمووی : لـە مزگەوتەکەمان جوێبێتەوەو لە ماڵی خۆیا دابنیشێ ، تەبەقێکیان هێنا سەوزەی تیابوو ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆنێکی ناخۆشی لێکرد ، پرسیی کە چیە ؟ خەبەریان دایێ بەوەی کە تیابوو ، ئەمریکرد بردیانە بەردەمی بەعزێ ئەصـــحابی ، کە چاوی پێکەوت کە ئەو بەعزە ئەصـــــــحابەی حەز ناکا بیخوا ئەمری پێفەرموو : بخۆ چونکی من موناجات لەگەڵ کەســێکا ئەکەم کـــە تۆ ـ موناجاتی لەگەڵ ناکەی .

٢٤٧٧/٥١ ـ عن أبي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] قال : لم نَعْدُ أن فتحت خيبر فوقعنا أصحابَ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في تلك البقلةِ الثوم ، والناس جياع ، فأكلنا منها أكلاً شديداً ، ثم رُحنا إلى المسجد [ أي المكان الذي كانوا يصلون فيه هناك ] فوجد رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الريح ، فقال : من أكل من هذه الشجرة الخبيثة شيئاً فلا يقربنا في المسجد • فقال الناس : حُرِّمت ـ حُرِّمت ، فبلغ ذلك النبيَّ ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : أيها الناس إنه ليس لي تحريمُ ما أحل الله لي ، ولكنها شجرة أكره ريحها • م ـ ٣/٢٣١ •

٢٤٧٨/٥٢ ـ وعنه أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مرَّ على زرّاعة [ أرض مزروعة ] بصل هو وأصحابه، فنزل ناس منهم، فأكلوا منه ولم يأكل آخرون ، فرحنا إليه ، فدعا الذين لم يأكلوا البصل وأخّر الآخرين حتى ذهب ريحها • م ـ ٣/٢٣٢ •

**تەرجەمە :**

ئەبوسەعیدی خودریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خەیبەر نەڕۆیینەوە[1] تا فەتح کرا ، ئەصحابی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ هەموو کەوتینەناو ئەو گژو گیاو سیرەوە ، خەڵق هەموو برسیی بوون ، خواردمان ئەمما خواردمان • لە پاشا چووینە ئەو جێگەیەی کە لەوێ نوێژمان لێ ئەکرد • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : هەرکەسێ لەو درەختە [ بۆن ] پیسەی خواردبێ لە مزگەوتا نزیکمان

(١) دانەر ـ خ ـ ئەم وشەی ئاوا نووسیوە ( نەرووبینەوە ) مەبەستی مانای ( لم نعد )وە نەمزانی چۆنە ، وەك سەرەوە نووسیم •

نەكەوێ • خەڵق وتیان : حەرامكرا ـ حەرامكرا • ئەو خەبەرە بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ گەیی فەرمووی : ئەی خەڵقینە بۆ من نیـە شـــتێك خوا بۆی حەڵاڵ كردبم من حەرامی بكەم ، ئەمما ئـەو درەختە بۆنەكەی ئەكەرهێنم •

ئەبوسەعید ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ و ئەصحابی تەشریفیان بـە لای دێیەری پیازێكا رابورد چەند كەسێ لە ئەصـــــحاب دابەزینو لێیانخوارد ، ئەوانی تری لێیـان نەخوارد ، چوونە خذمەتی ، ئەوانەی كە پیازیان نەخواردبو بانگكردو ئەوانەی كە خواردبوویان دووریخستنەوە •

ئەو كەسەی كە بۆنی ناخۆشی لێبێ بۆی دروســـــت نیە بچێتە ناو ئەوانەی پێیان ناخۆش بێ ، با نوێژی جومعەو جەماعەتیش بێ •

وكان ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] يوضع له الطعام وتقام الصلاة فلا يأتيها حتى يفرغ ، وإنه يسمع قراءة الإمام • ح ـ ٢/٣٨ • أثر موصول•

وقال أبو الدرداء [ رضي الله تعالى عنه ـ وصله عبدالله بن المبارك ] : من فقـه المرء إقباله على حاجتـه حتى يقبل على صـــــلاته وقلبه فارغ • ح ـ ٢/٣٧ • أثر •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ طەعامی بۆ دائەنراو قامەت ئەكرا بۆ نوێژ ، دەنگی ئیمامی ئەبیست ، نەئەچوو بۆ نوێژ تا لـە خواردنەكەی ئەبۆوە •

ئەبودەرداء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لـە تێگەیشـــتنیو عاقڵی پیاوە کە رووبکاتە ئەو ئیحتیاجی‌یەی کە هەیەتی ، سـا هەرچی ببێ بیکاو ئەمجا بە دڵێکی فارغ لە خەطەرە رووبکاتە نوێژەکەی •

[ ئەمانە مەشرووطن بەوە کە نوێژەکەی نەخاتە وەختی کەراهەتەوەو لە فەوتانی نەترسێ ] •

٢٤٧٩/٥٣ ـ عن عبدالله [ بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] قال : كنا نسلم على رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وهو في الصـــلاة فيرد علينا ، فلما رجعنا عند النجاشي [ رضي الله تعالى عنه ] سلمنا عليه فلم يرد علينا ، فقلنا : يا رسول الله كنا نسلم عليك [ = وأنت = في الصلاة ] فترد علينا ، قال : إن في الصـلاة شـــغلاً ، قال أعمش : فقلت لإبراهيم [ النخعي ] : كيف تصـــنع أنت ؟ قال : أرد في نفسي • ح ـ ١٩١/٦ • م ـ ٣٠٢/٣ • ح ـ ٣٣٥/٢ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵلای کوڕی مەســعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : سەلاممان لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەکرد ســـەلامەکەی ئەستەندینەوە ، کـە لـە لای نەجاشیی هاتینەوە ســـەلاممان لێ‌کـرد سەلامەکەی نەستەندینەوە ، عەرزمان‌کرد ، فەرمووی : لـە نوێـژا [ وەك قورئان خوێندنو ذیکرو دوعـا ] شـــوغلێکی زۆرزۆر هەیە • ئەعمەش ئەفەرموێ: لە ئیبراهیم پرسیی : تۆ چی ئەکەی ؟ فەرمووی : لـە دڵمـا ئەی‌ستێنمەوە •

٢٤٨٠/٥٤ ـ عن معاوية بن الحكم السـلمي [ رضي الله تعالى عنه ] قال : بينا أنا أصلي مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ إذ عطس

رجل من القوم . فقلت : يرحمك الله . فرماني القوم بأبصـارهم ، فقلت : وا ثكل أمياه ! ما شأنكم تنظرون إلي ؟ فجعلوا يضـــــربون أيديهم على أفخاذهم ، فلما رأيتهم يصمتونني لكني سكتت ، فلما صلى رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فبأبي هو وأمي ما رأيت معلماً قبله ولا بعـده أحسن تعليماً منه . فوالله ما كهرني [ ما انتهرني ] ولا ضربني ولا شتمني . ثم قال : إن هذه الصلاة لا يصـلح فيها شيء من كلام الناس ، إنما هـو التسبيح والتكبير وقراءة القرآن أو كما قال رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قلت : يا رسول الله إني حديث عهـد بجاهلية ، وقد جاء الله بالإسلام ، وإن منا رجالاً يأتون الكهان ، قـال : فـلا تأتهم ، ومنا رجـال يتطيرون ، قال : ذاك شيء يجدونه في صدورهم فلا يصـــدنهم . وقـال ابن الصباح [ محمد شيخ البخاري نفسه ] : فلا يصدنكم . قـال : قلت : ومنـا رجـال يخطون . قال : كان نبي من الأنبيـاء يخط فمن وافق خطـه فذاك . قال : وكانت لي جارية ترعى غنماً لي قِبَـل أُحـد والجوّانيّـة [ موضع بقرب أحد في شمالي المدينة ] فاطلعت ذات يوم فإذا الذئب قـد ذهب بشاة من غنمها ، وأنا رجل من بني آدم آسف كما يأسفون ، لـكني قد صككتها صكة ، فأتيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فعظم ذلك عليّ . قلت : يا رسول الله أفلا أعتقها ؟ قال ائتني بها ، فأتيته بهـا . فقال لها : أين الله ؟ قالت : في السماء . قال : من أنا . قالت : أنت رسـول الله . قال : اعتقها فإنها مؤمنة . م ـ ٣/١٩٤ .

**تەرجەمە :**

موعاویەی کوڕی حەکـەمی ســــەلەمیی ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ : لـە ومختێکا لـــە خـذمـەت پێغـەمـەرا ـ صـلى الله تعـالى

علیـه وسـلم ـ نوێژم ئەکـرد یـەکێ لە ئەهلی جەماعەتەکە پژمی پێم‌وت : ( یرحمك الله ) خەڵق هەموو چـاویـان تێ‌بڕیم ، وتم : دایك ڕۆڵەڕۆم بۆ بکا ! بۆچی تێمەفکرن ؟ دەستیان‌کرد بە بەڕان‌کێشانی خۆیانا بە دەست ، کە تێیان‌گەییم بێ‌دەنگم ئەکەن بێ‌دەنگ بووم ٠ کـە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نوێژەکەی کرد ، باوکو دایکم بە فیدای بێ ، نە لە پێش ئەو نە لە دوای ئەو هیچ موعەللیمێکم نەدیوە کە لەو چاکتر تەعلیمی خەڵق دابدا ٠ وەڵلاهی نە بەسەرما نەڕانی ، نە لێیدام ، نە جوێنی پێدام ، لە پاشا فەرمووی : ئەم نوێژە تێیا ناگونجێ خەڵق قسەی تیا بکا ، هەر عیبارەتـە لە تەسبیحاتو ( الله أكبر ) کردنو قورئان خوێندن ٠ یا شـــتێکی وای فەرموو ٠ [ راویی شکی بوە لە لەفظی پێغەمەرا ـ صـلی الله تعـالی علیـه وسلم ـ ] عەرزم‌کرد : ( یا رسول الله ) من تازەموسوڵمانم نزیکم بە زەمانی جاهیلییەت ، بەعزێ لە ئێمە ئەچنە لای کوڵێ‌نانی [ شتیان لێ ئەپرسـن ] فەرمووی:مەچۆرە لایان٠عەرزم‌کرد:بەعزێ پیاو لە ئێمە بەدیومنی بە بەعزێ شت ئەکەن [ ئەڵێن : ] تەدووم شەڕە ٠ فەرمووی : ئەوە شتێکە خەیاڵێکە پێ بە دڵیانا ٠ ئەوە مەنعیان نەکا ـ لە ریوایەتی محەمەدی [ ابن الصباح ]دا : مەنعتان نەکا ـ لە ئیشکردن ٠ [ یەعنی بەدیومنی نیە ] عەرزم‌کرد : بەعزێ لە ئێمە خەت‌ئەکێشن [ بەوە ئیستیخراجی شت ئەکەن ] فەرمووی پێغەمەرێ لە پێغەمەران خەتی ئەکێشـــا هەرکەسێ ئەو خەتەی کە ئەیکێشـێ ئەگەر موافیق بێ لـەگـەڵ خەتی ئـەو پێغەمەرە ئەوە باشە [ یەعنی ئەمما چۆن موافەقەی خەتی خۆی‌و خەتی ئەو پێغەمەرەی لێ‌مەعلووم ئەبێ ؟ کـە وابێ ئەوە حەرامە نەیکا ] ٠

ئیبنوصەباح ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ ئەفەرموێ : جاریەیەکم بوو مەڕی بـۆ ئەلەوەڕانم لە ئەطرافی ئوحودو جەووانیە ، ڕۆژێ مەڕەکـانی

بردەدەرێ گورگێ یەکێك لە مەڕەکانی برد ، منیش پیاوێکم لە بەنیئادەم چۆن ئەوان ئەسەف بۆ شت ئەخۆن منیش وا ئەســەف ئەخۆم زللەیێکم لە جارییەکە دا ، چوومە خذمەت پێغەمەر ـ صـلی الله تعـالی علیه وسلم ـ [ عەرزمکرد : زۆر بە گـەورەی گرت ] عەرزمکـرد : ( یـا رسـول الله ) کـە وابێ ئازادی ئەکەم • فەرمووی : بیهێنەرە لام • بردمـە خذمەتی ، لێیپرسی : خوا لە کوێیە ؟ عەرزیکرد : لە ئاسمانە • فەرمووی : من کێم ؟ عەرزیکرد : تۆ رەســـوولوڵڵای • فەرمـووی : ئـازادی کـــە چونکی موسوڵمانە •

ئەحکامی ئەم حەدیثە دوورو درێژە ، بـە موختەصەریی بەعزێ لــە شەرحی نەوەویی ـ رحمه الله ـ بەیانبکەم خاڵی لە فائیدە نیە •

(١) قســـەکردن لـە نوێژا ، یـا لەبـەر زەرووڕەت بێ یـا لەبەر مەســـڵەحەتی نوێژەکەیش بێ ، حەرامە ، نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە • ئەگـەر ئیحتیاجێ ظوهووری کرد پیاو ( سبحان الله ) بڵێ • ژنیش بەری دەســتی راستی بە پشتی دەستی چەپیا بکێشێ • بە ئیتتیفاقی حەنەفیو شـافیعیو مالیکیو جومهووری ســـــەلەفو خەلەف • لای ئەوزاعیی ئەگـەر بـۆ مەصلەحەتی نوێژ بێ دروستە ، بە دەلیلی حەدیثی ( ذو الیدین ) ئەمە کـە بە عەمد بێ • ئەگەر بە نیسیان بێ کەلامی کەم نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە • لای ئیمەو مالیکیو ئەحمەدو جومهوور • بە لای ئەبوحەنیفە ـ رضي الله تعالی عنه ـ وە بەتاڵی ئەکاتەوە • ئەگەر زۆر بێ نوێژ بەتاڵ ئەکـاتـەوە ( عنـد الأصح ) کەلامی جاهێلیش وایە قەلیل بەتاڵی ناکاتەوە زۆر بەتاڵی ئەکاتەوە• دەلیلی حەدیثی موعاویەی کوڕی حەکـەمو ( ذو الیدین )ە تەشـــــمیتی

عاطیس[1] بـە ـ یرحمه الله ـ بەتاڵی نـاکـاتـەوە ، بـە خیطاب بێ بەتـاڵی ئەکاتەوە • ئەوی لە نوێژا پیژمێ بە دڵ ( الحمد لله ) بڵێ سونئەتە •

(٢) فیعلی قەلیل نوێژ بـەتـاڵ ناکاتەوە • بۆ ئیحتیاجی کـەراهەتی نیە • فیعلی کەثیر بەتاڵی ئەکاتەوە با بۆ حاجەتیش بێ •

(٣) صەرفی نەظەر لە ئیشی نەزانو ، تەعلیمی •• سونئەتە •

(٤) چوونەلای کوڵێنانیو فاڵگرتنەوەو کتێبگرتنەوەو نوشتەیێ کە لە پێغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ مەئثوور نەبێ حەرامـە • کە حەرام بێ پارەپێدانیانو پارە = پێ = وەرگرتنیانو باوەڕپێکردنیـان حەرامە •

(٥) تەشائوم بە شت حەرامە نابێ عەمەلی پێ بکرێ • ئەگەر بە بێ ئیختیار بێ بە دڵی ئینسانا بەئسی نیە ، ئەمما شوێنی نەکەوێ •

(٦) ئیستیخدامی جاریە ـ کە ئێستە جاریە نیە ـ لە ئیشی صەحرادا دروستە •

(٧) بەوەندە کە ئیقرار بکرێ بە وجوودی خواو باوەڕ بکرێ بـە پێغەمەرێتی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئینســـــان بە موئمین حسێب ئەکرێ ، کۆڵینەوەی دروست نیە • ( راجع إيمان النووي ـ رحمه الله تعالی ـ ) •

(٨) ئازادکردنی موسوڵمان خێری زیاترە لە ئازادکردنی کـافـر • ئێستە هیچیان مەوجوود نیە •

---

(١) تەشمیتی عاطیس ئەوەیە کـە یەکێ پژمیو ( الحمد لله )ی کـرد تۆ پێی بڵێی : ( یرحمك الله ) •

(٩) کەفارەتی لەعەبددان ئازادکردنیەتی • [ ئەمە لە نەوەویدانیە ]•

**الاستعانة باليـد في الصلاة اذا كان من أمر الصلاة(١)**

( قال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ) : ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لە نوێژا ئینسان بە هەموو ئەعزایێکی ئیستیعانە ئەکا بۆ شتێ کە لە نوێژ بێ ؛ وەك پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ گوێی ئیبنوعەباسی گرتو خستیە لای راستیەوە • ئەبوئیسحاق ـ رحمه الله ـ شابقەکەی بە دەست لە سەری داگرتو بە دەست کردیەوە سەری • ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەستی راستی لـە نوێژا [ دانا لەسەر مەچەکی چەپی هەروا ئەمایەوە ] مالی بـە مەچەکی چەپیـا ، مـەگـــەر جێیێکی بخورێنێ یا جلێکی بەری رێك بخا [ یەعنی ئەو وەختە دەســـتی لەسەر مەچەکی هەڵەگرت ] یەعنی ئیستیعانە بە دەست بۆ ئەمە کـە جێێ بخورێنێ یا لیباسێکی ئیصلاح بکا بە دەست دروستە • ( بخاري ) •

٢٤٨١/٥٥ ـ عن زيد بن أرقم [ رضي الله تعالى عنه ] إن كنا لنتكلم في الصلاة [ على عهد النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ] يكلم الرجل صاحبه بحاجتـه ، وهـو إلى جنبـه في الصـــــلاة ، حتى نـزلت ( حافظوا على الصلوات ) ••• الآية ، فأمرنا بالسكوت ونهينا عن الكلام • ح ـ ٢/٣٣٥ • م ـ ٣/٢٠٣ •

**تەرجەمە :**

زەیدی کوڕی ئەرقەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە زەمانی پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە نوێژا قسەمان ئەکرد ؛ ئینســان

(١) کردنی ئیشێك لە نوێژا بە دەست کە ئەو ئیشە خۆی لـە کاروبـاری نوێژ بێت .

لەگەڵ ئەوەی لە تەنیشتیەوە بوو لە نوێژا قسەی ئەکرد بۆ ئیحتیاجیی خۆی تـا ئایەتی ( ••• وقوموا لله قانتین )[1] نازڵ بوو = واتە : = بە تەذەللول لە حوزووری خوادا بوەســــتن ، بەوە ئەمرمان پێ‌کرا کە بێ‌دەنگ ببین نەهیمان لە قسەکردن لێ‌کرا •

( قتادة [ وصله عبدالرزاق ] ) ئەگەر کەسێ جلی دزراو لە نوێژا بوو نوێژەکە ببڕێ‌و بچێ بە شوێن دزەکەدا • ح - ٢/٣٤٢ •

ئەگەر کەسێ کە لە نوێژا بوو بە زوڵم ماڵی لێ‌بستێنن ، یـا ئاگرێ کەوتەوە ، یـا لافاوێ هات ، یـا دڕەندەیێکی لێ‌پەیدا بوو ، یـا صاحیب قەرزێ داوای قەرزی لێ‌کردو نەی‌بوو بیداتەوەو لە حەبسی ئەترسـا ••• لەم صورەتانەدا نوێژەکەی نەبڕێ‌و هەڕا بکا وەك نوێژی شیددەتی خەوف نوێژەکەی تەواو بکا ( عند الشافعي ) •

٢٤٨٢/٥٦ - أزرق بن قيس : كنا بالأهواز نقـاتل الحرورية ، فبينما أنا على جُرُف نهر [ دجيل ] إذا رجل يصلي وإذا لجام دابته بيده ، فجعلت الدابة تنازعه وجعل يتبعها • قال شعبة : هو أبو برزة الأسلمي[رضي الله تعالى عنه ] فجعل رجل من الخوارج يقول : اللهم افعل بهذا الشيخ • فلما انصرف الشيخ قال : إني سمعت قولكم ، وإني غزوت مع رسول الله ـ صـــلى الله تعالى عليه وسلم ـ ست غزوات أو سبع غزوات أو ثمان ، وشهدت تيسيره ، وإني إن كنت أن أراجع مع دابتي أحب إلي من أن أدعها ترجع إلى مألفهـا فيشق علي • ح - ٢/٣٤٢ •

(١) البقرة/٢٣٨ •

( رەنگە لە ئەشراطو فیتەنا نووسیبێتم )[1]

**تەرجەمە :**

ئەزرەقی کوڕی قەیس ئەفەرموێ : لە ئەهواز بووین شەڕمان لەگەڵ حەرەووریی ( خاریجی ) ئەکرد لە کەناری نەهری دوجەیل وەستابووم پیاوێ نوێژی ئەکرد دەســـــــتەجڵەوی ولاغەکەی بەدەستەوە بوو ولاغەکەی رای ئەکێشاو ئەو پیاوەیش لەگەڵی ئەچوو لـە نوێژەکـەدا ، ئـەو پیـــاوە ئەبوبەرزەی ئەسلەمیی بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ ، پیاوێ لـە خەواریج ئەی فلان ئەیوت : خوایا ئـەم پیـاوە پیرە وا لێ بکە [ جوێنی پێ ئەداو دۆعای لێ ئەکرد کە ئەســــپەکەی بەرەڵلا بکاو نوێژەکەی تەواو بکا ، ئەزرەق ئەڵێ : پێم وت : وات ئەبینم کە خوا رێی لێ ون کردووی کە جوێن ئەدەی بە پیاوێ لە ئەصحابی پێغەمەر ـ صـلی الله تعـالی علیه وســلم ـ ( حماد وعمرو بن مرزوق ) ] کە ئەبوبەرزە [ رضي الله تعالى عنه ] ســەلامی دایەوە فەرمووی : گوێم لێ بوو کە چیتان وت ، من لە خذمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ شەش یـا حەوت یـا هەشت غەزام کردوە ، چاوم بەوەی کەوتوە کە ئیشی سووك کردوە لە سەر ئوممەتی خۆی ، من لەگەڵ ولاخەکەما لە نوێژا بێم و بچم لە لام چاکترە کە بەری دەم و بڕوات بۆ ئەو جێی کە پێوە راهاتوە لە پاشا بکەومە زەحمەت و مەشەقەتەوە .

لە ریوایەتی ئیبنوحەزما : حەوت غەزام کردوە ، بە بێ شك .

**لەبەر زەروورەت حەرەکاتی کەثیرە لە نوێژا نوێژ بەتاڵ ناکاتــەوە .** تـا ئەبوبەرزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم نەوعەی نەدیبێ بـە رەئی خۆی نایکا .

---

(1) نەخەیر نەمدۆزییەوە ، رەنگە نەنووسرابێ .

٢٤٨٣/٥٧ ـ عن عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] سـألت رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن الالتفات في الصلاة ، فقال : هو اختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد • ح ـ ٧٦/٢ • د ، ن •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م پرسیی لـە خوصـــووصی ئاوڕدانەوە لـــە نوێژا ، فەرمووی : ئەوە دزیییێکی شەیتانە لە نوێژی عەبدی ئەدزێ •

٢٤٨٤/٥٨ ـ عن جابـر بن عبدالله ـ رضـي الله تعـالى عنهما ـ قال : بعثني رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في حاجة له = فانطلقت = [ وهو منطلق إلى بني المصطلق • م ] ثم رجعت وقد قضيتها ، فأتيت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ وهو يصلي على بعيره • م ] فسلمت عليه ، فلم يرد عليّ ، فوقع في قلبي ما الله أعلم به ، فقلت في نفسي : لعل رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وجد علي أني أبطأت عليه [ فكلمته فقال لي بيده : هكذا ، وأومأ زهير بيده • م ] ثم سلمت عليه فلم يرد عليّ ، فوقع في قلبي أشد من المرة الأولى [ ثم كلمته ، فقال لي : هكـذا ، وأومـأ زهير أيضاً إلى الأرض وأنا أسمعه يقرأ يوميء برأسه • م ] ثم سـلمت عليه فرد عليّ ، فقال [ ما فعلت في الذي أرسلتك إليه ؟ ] : إنما منعني أن أرد عليك أني كنت أصلي ، وكان على راحلته متوجهاً الى غير القبلة • ح ـ ٣٤٥/٢ • م ـ ٢٠٤/٣ • بفرق كما رأيت •

٢٤٨٥/٥٩ ـ وعنه ـ أيضاً ـ قال : إن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بعثني لحاجة ثم أدركته وهو يسير ، قال قتيبة : يصلي ، فسـلمت

عليه فأشار إلي ، فلما فرغ دعاني ، فقال : إنك ســلمت آنفاً وأنا أصلي ، وهو موجه حينئذ قبل المشرق • م ـ ٣/٢٠٣ •

**تەرجەمە :**

جابير ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ تەشريفی بۆ بەنی موصطەلەق ئەچوو ، منی بۆ ئیشێ نـارد ، چووم‌و ئیشەکەم کردو گەڕامەوە خدمەتی ، لە ســـەر وشـــترەکەی بەرەومەشریق نوێژی ئەکردو سەلامم لێ‌کرد ، جوابی نەدامەوە خوا ئەزانێ کە بە دڵ چەندم پێ ناخۆش بوو ، وتم : رەنگە پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ لێم دڵگیر بووبێ کە درەنگم پێ‌چوە ، لە پاشـا ســەلامم لێ‌کردو جوابی نەدامەوە ، لە ئەووەڵ جارم پێ‌ناخۆشتر بوو ، لە پاشـــا سەلامم لێ‌کردەوەو سەلامەکەی سەندمەوە ، فەرمووی : چیت‌کرد لـەو ئیشەی کە تۆم بۆ نارد ؟ لە نوێژا بووم بۆیە جوابی سەلامەکەتم نەدایەوە ، بەسەر وشترکەیەوە بوو رووی لە غەیری قیبلە بوو •

لە ریوایەتی موسلیما کە سەلامی لێ‌کرد پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئیشارەتی کرد کە نوێژەکەم ، زوهەیر تەصویری ئیشـــارەتەکەی کرد بە دەستی ئیشارەتی ئەرزی بۆ کردێن •

لە نوێژا جوابی سەلام نادرێتەوە • ئیشـــارەتکردن بە دەســـت دروستە •

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ رضـي الله تعـالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە نوێژێکی رۆژگیرانا لە سوجدەدا فووی لە شتێك کرد •

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە نوێژا بە خەیاڵ تەدارەکی لەشکرم ئەکرد •

٢٤٨٦/٦٠ ـ قال أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول النـاس : أكثر أبو هريرة ، فلقيت رجلاً ، فقلت : بماذا قرأ رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ البارحة في العتَمَةَ ؟ فقال : لا أدري • فقلت : لم تشهدها [ شهودا ] • قال : بلى • [ قال : ] قلت : لكن أنا أدْري ؛ قـرأ ســـورة كذا وكذا • ح ـ ٣٤٨/٢ •

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئەفـەرموێ : خەڵق ئـەڵێن : ئەبوهورەیرە چەنـدە زۆر حـەدیث ریوایـەت ئەکـا ! بـە پیـاوێ گەیيم لێمپرسیی : ئیمشەوی رابوردو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لـە نوێژی خەوتنانا چ سوورەتێکی خوێند ؟ وتی : نازانم • وتم : بۆ حازری ئەو نوێژە نەبووی ؟ وتی : با حازری بووم • وتم : ئەمما من ئەزانم ئـەو سوورەتەو ئەو سوورەتەی خوێن •

لە نوێژا خەیاڵ لەشتکردنو غەفلەت لـە خوێندنی ئیمام مەکرووهـە ئەمما نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە •

تمت المبطلات والمكروهات بعون الله ـ تبارك وتعالى ـ •

ئەمجا دەست بکەین بە سوجدەی تیلاوەت ؛ چونکی سوجدەیێکە لە نوێژو لە غەیری نوێژا ئەبێو موناسب بە سوجدەی سەهوەو موناسەبەیشی بە فەضائیلی قورئان هەیە •

٢٤٨٧/٦١ ـ عن عبدالله بن عمر [ رضـي الله تعـالى عنهما ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ كان يقرأ القرآن ، فيقرأ ســورة فيها سجدة

فیسجد ونسجد معه حتی ما یجد بعضنا موضعاً لمكان جبهته • ح - ٢/ ٢٧٣
م - ٣/ ٢٦٤ وفي رواية فيه : في غير صلاة •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ قورئانی ئەخوێند ، سوورەتێکی ئەخوێند کە سوجدەی تیابوو سوجدەی ئەبرد ، ئێمەیش لەگەڵ ئەوا سوجدەمان ئەبرد ، ئەوەندە زۆر بووین لەبەر زۆریی بەعزێکمان جێی نەبوو ناوچاوانی لێدانێ • ئـەم سوجدەبردنە لە غەیری نوێژا بوو •

٦٢/ ٢٤٨٨ - عن عبدالله [ بن مسـعود - رضي الله تعالى عنه - ] عن النبي - صلی الله تعالی علیه وسلم - أنه قرأ ( والنجم ) فسجد فيها وسـجد من كان معه ، غير أن شيخاً [ أمية بن خلف ] أخذ كفـاً من حصى أو تراب فرفعه إلى جبهته وقال : يكفيني هذا • قال عبدالله [ رضي الله تعالى عنه ] : لقد رأيته بعد قتل كافراً [ يوم بدر قتله بلال - رضي الله تعالى عنه - ] •
ح - ٢/ ٢٦٩ • د ، ن • م - ٣/ ٤٦٣ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سوورەتی ( والنجم )ی خوێند سوجدەی برد ئەوانەی لە خذمەتیا بوون سوجدەیان برد ، ئومەییەی کوڕی خەلەف نەبێ سوجدەی نەبرد ، مستێ خـۆڵ یـا بەردە وردەی ئەرزەکەی هەڵگرت بۆ ناوچاوانی وتی : ئەمە کیفایەتی من ئەکا • عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ئەفەرموێ : لە ڕۆژی بەدرا چاوم پێیکەوت بە کافریی کوژرا •
= لە ڕۆژی بەدرا بیلال ـ رضي الله تعالی عنه ـ کوشتی = •

بوخاریی ئەم حەدیثەی لە مەبعەثی پێغەمەرا ــ صلی الله تعـالی علیــه وسلم ــ و لە مەغازیداو لە تەفسیرا ذیکر کردوه •

٢٤٨٩/٦٣ ــ عطاء بن یسار [ رحمه الله ] سأل زید بن ثابت [ رضـي الله تعالی عنه ] عن القراءة مع الامـام فقال : لا قراءة مع الإمـام في شيء ، وزعم انه قرأ علی رسول الله ــ صلی الله تعالی علیـه وسـلم ــ ( والنجم إذا هوی ) فلم یسجد • م ــ ٣/٢٦٤ • ح ــ ٢/٢٧٢ • م ، ت ، د •

**تەرجەمە :**

عەطاء لە زەیدی کوڕی ثابیتی پرسیی ــ رضي الله تعالی عنـه ــ لـــه قیرائەت لەگەڵ ئیماما ، زەید ــ رضي الله تعالی عنه ــ فەرمووی : لەگـەڵ ئیماما خوێندن نیه ، هەم زەید فەرمووی : ســـــوورەتی ( والنجم )م بۆ پێغەمەر ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ خوێند سوجدەی نەبرد •

٢٤٩٠/٦٤ ــ عن أبي سلمة بن عبدالرحمن أن أبـا هریرة [ رضي الله تعالی عنه ] قرأ لهم : ( إذا السماء انشـــقت ) فسجد فیها ، فلما انصـــرف أخبرهم أن رسول الله ــ صلی الله تعـالی علیــه وسلم ــ ســـــجد فیهـا • م ــ ٣/٢٦٦ • ح ــ ٢/٢٧٣ •

٢٤١٩/٦٥ ــ وعنه قال : سجدنا مع النبي ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ في ( إذا السماء انشقت ) و ( اقرأ باسم ربك ) •

٢٤٩١/٦٦ ــ وعن أبي رافع قال : صـلیت مع أبي هریرة [ رضي الله تعالی عنه ] صلاة العتمة فقرأ ( إذا السماء انشقت ) فســـجد فیها ، فقلت : ما هذه السجدة ؟ قال : سجدت بها خلف أبي القاسم ــ صلی الله تعالی علیه وسلم ــ فلا أزال أسجد بها حتی ألقاه • ح ــ ٢/٨٦ • م ــ ٣/٢٦٧ •

**تەرجەمە :**

ئەبوسەلەمەو ئەبوڕافیع بـە عیبـارەتی موتەقاریبە ئەفەرموون : لـە پشت ئەبوهورەیرەوە نوێژی خەوتنانمان کرد ، لە نوێژا ( إذا الســـــماء انشقت )ی خوێندو سوجدەی برد ، کە سەلامی دایەوە ، ئەبوڕافیع ئەڵێ : لێمپرسیی : ئەم سوجدەیە چیە ؟ فەرمووی : لە پشت ئەبولقاسمەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سوجدەم بۆ بردوە تـا ئەگەمەوە بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ هەر ئەیبەم ٠

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ بە دەستی یێدەزنوێژ سوجدەی ئەبرد ، هیچ کەس موافەقەی نەکردوە ٠ ح ـ ٢/٢٧١ ٠

٦٧/٢٤٩٣ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعـالى عنهما ] قـال : ( ص ) ليس من عزائم السجود ، وقد رأيت النبي ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ يسجد فيها ٠ ح ـ ٢/٢٧٠ ٠ د ، ت ٠

**تەرجەمە :**

= ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ = ئەفەرموێ : ســوجدەی = سوورەتی ( ص ) = لەو سوجدانە نیە کە لازم بێ ، پێغەمەر ـ صــلی الله تعالی علیه وسلم ـ م دیوە سوجدەی تیا ئەبرد ٠

٦٨/٢٤٩٤ ـ عن مجاهد ـ رحمه الله ـ قال : قلت لابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : أسْجُد في ( ص ) ؟ فقرأ ( ومن ذريته داود وسليمان ٠٠ حتى أتى ـ فبهداهم اقتده )[1] فقال : نبيكم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ممن أمر أن يقتدى بهم ٠ ح ـ ٥/٣٩٨ ٠

(١) الانعـام/٩٠ ٠

**تەرجەمە :**

موجاهیـد ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : عەرزی ئیبنوعەبـاسـم‌کرد ـ رضـــي الله تعـالى عنـــه ـ ســـوجده بـۆ ( ص ) ببـەم ؟ ئـەم ئایەتەی خوێندەوە : ( ومن ذريته داود .. إلى : فبهداهم اقتده ) فەرمووی : پێغەمەری ئێوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەمری پێ‌کراوە کە ئیقتیدا بە هیدایەتی ئەوان بکا [ ئەوان سوجدەیان بردوە پێغەمەریش ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەبەر ئەو ئەمرە سوجدەی بردوە ، تۆیش ببیە ] .

٢٤٩٥/٦٩ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سجد بالنجم وسجد معه المسلمون والمشركون والجن والإنس . ح ـ ٢٧١/٢ . ت ، ح ـ ٧ / في سورة النجم .

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە قیرائەتی سوورەی ( والنجم ) سوجدەی برد ، لەگەڵ ئەو موسولمانو موشریك ، ئینسو جین سوجدەیان برد .

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەو وەختەدا یا لە دایك نەبوە یـا زۆر منـاڵ بوە ، ئاگای لـە وەقعـەکە نەبوە ، کـە وابێ حەدیثەکـەی مورسەلی صەحابیە ، حوکمی مەرفووعی هەیە . یا لە پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ وە یـا لەوانەی کـە حازری وەقعەکە بوون .. بیستوە . ئیطلاعی بەسەر ســوجدەی جیننا ئەبێ = بـە = ئیخباری پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ بووبێ . موراد لـە ئینسو جین ئەوانەن کە لەو مەجلیسەدا حازر بوون .

٢٤٩٦/٧٠ ـ عن ربيعة بن عبدالله ، وكان من خيار الناس ، عما حضر من عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قرأ يوم الجمعة على المنبر بسورة النحل حتى إذا جاء السجدة نزل فسجد وســجد الناس • حتى إذا كانت الجمعة القابلة قرأ بها حتى إذا جاء السجدة قال : يا أيها النـاس إنـا نمر[*] بالسجود فمن سجد فقد أصاب ومن لم يسـجد فلا إثم عليه ، ولـم يسجد عمر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ • وزاد نافع عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما : إن الله لم يفرض السجود إلا أن نشاء • ح ـ ٢/٢٧٤ •

**تەرجەمە :**

رەبیعەی کوڕی عەبدوڵلا کـە لـە خیـاری خەڵقی ئـەو وەختە بوە خەبەری داوە لەوە کـە حازری خوطبەی ئیمامی عومەر بوە ـ رضـي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : ڕۆژی جومعە لەسەر مینبەر سوورەی نەحلی خوێن تـا گەیی‌یە سوجدەکەی تەشریفی هاتەخوارێو ســوجدەی برد ، کـە جومعەی دوایی هات دیســـان ئەو ســـوورەتەی خوێن تـا گەیی‌یە سوجدەکەی ، فەرمووی : ئەی خەڵقینە ئێمە لە قیرائەتا بـە لای ئایـەتی سوجدەدا ئەڕۆین [ یەعنی ئەیخوێنین ] هەرکەسێ ســـوجدەی برد ئەو کەسە سوننەتی بەجێ‌هێناوە ئەگەر ســـوجدەی نەبرد گوناهی ناگاتێ ، خۆی سوجدەی نەبرد •

نافیع لە ئیبنوعومەرەوە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ لە ریوایەتی خۆیـا لەم حەدیثە ئەوەندەی لێ زیادکردوە کە ئیمامی عومەر ـ رضـي الله تعـالی

عنه ـ فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ ســـوجدەی تیلاوەتی فەرزنەکردوە ، بەڵکو سونتەتە خۆمان هەوەسمان بێتێ ئەیبەین • حەنەفی لایان واجبە •

سوجدەی تیلاوەت سونتەتە ، تەکبیری تەحەڕڕوم‌و سەلامی هەیە یـا نیە ؟ نە لە موسلیما = نـە = لە بوخاری‌یا •• بەیان نەکراوە •

( تم شـکراً لله ) ١٩٤١/٦/٧

# صــلاة المسافر(1)

٢٤٩٧/١ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ زوج النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنها قالت : فرضت الصلاة ركعتين ـ ركعتين في الحضر والسفر ، فأقرت صلاة السفر ، وزيد في صـــلاة الحضر • ح ـ ٢٨١/٢ ، ح ـ ٣٧٧/١ ، م ـ ٣٩٧/٣ • واللفظ لهذا •

وفي أخرى : فرض الله الصـــلاة حين فرضـــها ركعتين ، ثم أتمها في الحضر ، فأقرت صلاة السفر على الفريضة الأولى • م ـ ٣٩٧/٣ •

ولفظ البخاري عنها : قالت : الصلاة أول ما فرضت ركعتان ، فأقرت صلاة السفر ، وأتمت صلاة الحضر • قال الزهري : فقلت لعروة : ما بـال عائشـــة تتم ؟ قال : تأولت ما تأول عثمان [ رضي الله تعالى عنه وعنها ] • ح ـ ٢٨١/٢ • ن •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ی حەرەمی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ ئەفەرموێ : لــە ئەووەلــەوە کــە نوێژ فەرزکرا دوورکات ـ

(1) نوێژی کۆچەریی •

دوورِكات فەرزكرا ، نوێژی سـەفەر لـە سەر حاڵی خۆی هێڵرایەوە ، لە نوێژی حەضەرا لێی زیادكرا •

ئیبنوشەهاب ئەفەرموێ : لە عورووەم پرسیی : ئەی بۆچی حەزرەتی = عایشە = ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە سـەفەرا چواررِكات ـ چواررِكات ئەكا ؟ فەرمووی : وەك ئیمامی عوثمان تەئویلی حەدیثەكـەی كردوە كـە قەصرو تەواوكردن هەردوكیان دروستە • ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیختیاری ئیتمامی كردوە • حەزرەتی عایشـــە ـ رضي الله تعـالى عنها ـ یش وای كردوە •

[ ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ كە تەشـــریفی ئەچوو بۆ مەككە لە مەككەدا چواررِكات ـ چواررِكاتی ئەكرد • كە تەشریفی ئەچوو بۆ مینا دوورِكات ـ دوورِكاتی = ئەكرد = كە لە حەج ئەبۆوەو لە مینـادا ئیقامەتی ئەكرد نوێژەكانی تەواو ئەكرد • یەعنی كە سەفەریی بووبێو لـە حاڵی رۆیینا بووبێ قەصری كردوە ، لە جێیێ موددەتێ دانیشتبێ تەواوی كردوە • قسطلاني عن أحمد ] •

٢٤٩٨/٢ ـ عن يعلى بن أمية قال : قلت لعمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] : ( فليس عليكم جناح أن تقصروا = من = الصلاة إن خفتم أن يفتنكم الذين كفروا )[١] فقد أمن الناس ؟ فقال : عجبت مما عجبت منـه ، فسألت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن ذلك ، فقال : صـدقة تصدق الله بها عليكم فاقبلوا صدقته • م ـ ٣٩٩/٣ •

(١) النســـاء/١٠١ •

**تەرجەمە :**

یەعلای کوڕی ئومەییە - رحمه الله - ئەفەرموێ : لە عومەر - رضي الله تعالى عنه - م پرسیی : خوا - عز وجل - لە سوورەی نیسادا ئەفەرموێ : ئەگەر لەوە ترسان کە کافران بتانخەنە فیتنەوە گوناهتان ناگاتێ کـە نوێژ کورت بکەنەوە • ئێستە کە خەڵق ترسیان لە هیچ نیەو ئەمینن ئیتر بۆچی قەصر ئەکەین ؟ فەرمووی منیش وەك تۆ کەوتمە تەعەجوبەوە لـە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - م پرسیی فەرمووی : ئەوە صەدەقەیێکە خوا پێیبەخشیون ، صەدەقەکەی قەبووڵ بکەن •

لە سەفەرا قەصرو ئیتمام دروستە ، ئەمما قەصـــر خێرترە لە ئیتمام • لای ئیمامی ئەعظەم - رضي الله تعـالى عنـه - لـە سەفەرا ئیتمام گوناهەو قەصر واجبە •

٢٤٩٩/٣ - عن ابن عباس - رضي الله تعـالى عنهما - قال : فرض الله الصلاة على لسان نبيكم - صلى الله تعالى عليه وسلم - في الحضر أربعـاً ، وفي السفر ركعتين ، وفي الخوف ركعة [ أي مع الإمام ، وأخرى وحده ] • م - ٣٩٩/٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : خوا - عز وجل - لە سەر زمانی پێغەمەری ئێوە - صـــلى الله تعـالى عليـه وسلم - نوێژی [ چوار ڕکاتی ] لە حەضەرا چوار رکات ، لە سەفەرا دوو رکات ، لە خەوفا رکاتێ فـەرزکـردوە [ یەعنی لـەگـەڵ ئیمام رکاتێ لـە پاشـــا خۆیشی بە تەنها رکاتێ • نەوەوی ] •

٢٥٠٠/٤ ـ عيسى بن حفص بن عاصـــم بن عمر = بن = الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] عن أبيه ، قال : صـــحبت ابن عمر في طريق مكة ، قال : فصلى لنا الظهر ركعتين ، ثم أقبل وأقبلنا معه حتى جاء رحله وجلس وجلسنا معه فحانت منه التفاتة نحو حيث صلى ، فرأى ناساً قياما ، فقـال : ما يصنع هؤلاء ؟ قلت : يسبحون . قال : لو كنت [ أي في غير منى ] مسبحاً أتممت صلاتي . يا ابن أخي إني صحبت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ في السفر فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله ـ تعالى ـ وصـحبت أبا بكر فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله ، وصـــحبت عمر فلم يزد على ركعتين حتى قبضه الله ، ثم صحبت عثمان فلم يزد [ أي في غير منى ] على ركعتين حتى قبضه الله ، وقد قال الله ـ تعالى ـ : ( لقد كان لكم في رسـول الله أسوة حسنة )[1] . م ـ ٣/٤٠٠ .

٢٥٠١/٥ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : صلى رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بمنى ركعتين ، وأبو بكر بعده ، وعمر بعد أبي بكر ، وعثمان صدراً من خلافته [ ثمان ، أو قال ست سنين . م أخرى ] ثم إن عثمان صلى بعد أربعاً [ بمنى . م في أخرى ] فكان ابن عمر [ رضـي الله تعالى عنهم جميعاً ] إذا صلى مع الإمام صلى أربعاً ، وإذا صلاها وحده صلى ركعتين . م ـ ٣/٤٠٥ .

**تەرجەمە :**

حەفصی کوڕی عاصیمی کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە رێی مەککەدا بووم بە رەفیقی مامە عەبدوللاّم کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوو رکـــات نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین ،

(١) الاحـــزاب/٢١ .

گـەڕایـەوەو لـە خذمەتیـا گەڕاینەوە تـا هاتـە لای بارخانەکەی خۆی دانیشتو لە خذمەتیا دانیشتین ، ئاوڕێکی دایەوە بۆ ئەو جێی نوێـژمـان لێ کردبوو ، بەعزێ خەڵقی بە پێیانەوە دی ، پرسیی : ئەمانە چی ئەکەن ؟ عەرزمانکرد : سوننەت ئەکەن ، فەرمووی : ئەگەر ســونەتم بکردایـە نوێژە فەرزەکەم تەواو ئەکرد ، ئەی کوڕی برای خۆم لـە ســەفەرا لـە خذمەت پێغەمەرا بووم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تـا خوا ـ عز وجل ـ بانگیکردەوە حوزووری خۆی ، لە دوو رکات زیاتری نەکرد ، لە خذمەت ئەبوبەکرو عومەریشا بووم تا وەفاتیان کرد لە دوو رکات زیاتریان نەکرد ، ئیمامی عوثمانیش شەش یـا هەشت ساڵ لە ئەووەڵی خەلافەتیا دوو رکاتی کرد ، لە دوای ئەوە لە مینادا چوار رکـاتی کرد ، خوا فەرموویەتی : بۆ ئێوە لە پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفعـــاڵو ئەقوالێکی باش هەیە کە ئێوە لەوەدا ئیقتیدای پێبکەن ، حەفص ئەفەرموێ : ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهم أجمعين ـ لە دوای ئەوە کە ئیمامی عوثمان لە مینادا چوار رکاتی کرد بە تەنها دوو رکاتو لەگەڵ ئیماما چوار رکاتی ئەکرد .

٢٥٠٢/٦ ـ عبدالرحمن بن يزيد يقول : صـلى بنا عثمان بن عفـان ـ رضي الله تعالى عنه ـ بمنى أربع ركعات ، فقيل ذلك لعبد الله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ فاسترجع ، ثم قال : صليت مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بمنى ركعتين ، وصليت مع أبي بكر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ بمنى ركعتين ، وصليت مع عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ بمنى ركعتين ، فليت حظي [ نصيبي ] من اربع ركعات ركعتان متقبلتان .

ح ـ ٢٧٨/٢ . م ـ ٢٠٦/٣ ، د ، ن .

**تەرجەمە :**

عـەبـدوڕەحمانی کوڕی یـەزیـد ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە مینادا چوار رکات نوێژی پێکردین • ئەمەیان عەرزی ئیبنومەسعود کرد ، فەرمووی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) لە دواییا فەرمووی : لە خدمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و ئەبوبەکرو عومەرا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە مینادا دوو رکاتم کـــرد ، کاشکی لە باتی ئەو چوار رکاتە دوو رکاتی مەقبووڵ ببوایە بە نەصیبم • [ یەعنی دوو رکات لە چوار رکات ثەوابی زیاترە ] • وەلحاصڵ ئیتمام لـە سەفەرا هەر ئیمامی عوثمان ئیحداثی کردوە ، حەزرەتی عایشەیش ـ رضي الله تعالى عنها ـ چاوی لەو کردوە •

٢٥٠٣/٧ ـ حارثة بن وهب الخزاعي أخو عبيدالله بن عمر لأمه [ رضي الله تعالى عنه ] قال : صليت خلف رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بمنى والناس أكثر ما كانوا ، فصلى ركعتين في حجة الوداع [ آمن ما كان الناس وأكثر • أخرى م ] = م ـ ٤٠٦/٣ =

**تەرجەمە :**

حاریثەی کوڕی وەهەبی خوزاعیی برای دایکیی عوبەیدیللای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەفەرموێ : لە وەختێکا کە خەڵق زۆر لە ئەمینیدا بوونو هیچ ترسیان نەبوو و لـە هەموو وەخت زیاتـر بوون •• لە مینادا لە پشت پێغەمەرەوە ـ صـلى الله تعالى عليه وسـلم ـ دوو رکاتم کـرد •

**في كم تقصر الصـلاة ؟[1] :**

وسمى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوماً وليلة سفراً ، وكـان ابن عمر وابن عباس ـ رضـي الله تعـالى عنهم ـ يَقْصُران ويُفْطِران في أربعة بُرُد ، وهي ستة عشر فرسخاً • ح ـ ٢/٢٧٩ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ شەوو رۆژێ موسـافيرى بـە سەفەر ناو ناوە • ئيبنوعومەرو ئيبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لــە شانزە فەرسەخ مەسافەدا قەصرو ئيفطاريان كردوە • ( وصله البيهقي ) •

ئيمامى عەلى ـ رضي الله تعالى عنه ـ له كووفه چوەدەرێ قەصـرى نوێژى كرد چاوى له ماڵەكانى كووفه بوو ، عەرزيانكرد : ئەمە كووفەيە • فەرمووى : نوێژ تـەواو ناكـەين تـا ئەچينه نـاو شـــارى كووفەوە • ( وصله الحاكم ) •

٨/٢٥٠٤ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : صليت الظهر مـع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بالمدينة أربعاً و [ العصر ] بذي الحليفة ركعتين • ح ـ ٢/٢٨١ • م ـ ٣/٤٠٢ •

**تەرجەمە :**

ئەنەسى كوڕى ماليك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : له مەدينەدا نوێژى نيوەڕۆم له خذمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ چـوار ركات كرد • نوێژى عەصرم له خذمەتيا له ( ذو الحليفة ) دوو ركات كرد •

---

(١) له چەنداو تا چەند قەصر ـ نوێژ كورتكردنەوە ـ دروستە ؟

٩/٢٥٠٥ ـ عن ابن عباس [ رضـي الله تعالى عنهما ] قال : أقام النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ سنة الفتح بمكة ] تسعة عشر يقصر ، ونحن إذا سافرنا [ فأقمنا ] تسعة عشر قصرنا ، وإن زدنا أتممنا • ح ـ ٢/٢٧٦ •
د ، ت ، جه • ح ـ ٢/٢٨٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ ساڵی فەتح لە مەككەدا نۆزدە رۆژ بەند بوو قەصری ئەكرد ، ئێمەیش كە سەفەر بكەین نۆزدە رۆژ بەند ببین نوێژ قەصـــــر ئەكەین ، ئەگەر زیاتر بەند ببین نوێژەكەمان تەواو ئەكەین •

١٠/٢٥٠٦ ـ أنس [ رضي الله تعـالى عنه ] يقول : خرجنـا مع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ من المدينة إلى مكة ، فكان يصلي ركعتين ـ ركعتين حتى رجعنا إلى المدينة [ قال يحيى الراوي : ] قلت [ لأنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] : أقمتم بمكة شيئاً ؟ قال : أقمنا بها عشراً • ح ـ ٢/٢٧٦ •
م ـ ٣/٤٠٤ • د ، ت ، جه ، ن •

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خذمــەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە مەدینەوە تـا مەككە چووین ، تـا گەڕاینەوە مەدینە دوو ڕكات ـ دوو ڕكاتی ئەكرد • یەحیا ئەفەرموێ : لێم‌پرسیی : لە مەككەدا چەند رۆژ بەند بوون ؟ فەرمووی : دە رۆژ •

١١/٢٥٠٧ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يصلي على حمار وهو موجـه إلى خيبر •
م ـ ٣/٤١٠ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ سواری گوێدرێژێ بووبوو نوێژی ئەکرد رووی لە خەیبەر بوو •

٢٥٠٨/١٢ ـ عن سعيد بن يسار أنه قال : كنت أسير مع = عبدالله = ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] بطريق مكة ، فقال سعيد : فلما خشـيت الصبح نزلت فأوترت ثم أدركته فقال لي ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أين كنت ؟ فقلت له : خشيت الفجر فنزلتُ فأوترت ، فقال عبدالله [ رضي الله تعالىعنه ] : أليس لك في رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أسوة ؟ فقلت : بلى والله • قال : إن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوتر على راحتله • ح ـ ٢٢٢/٢ • ت ، جه • م ـ ٤١٠/٣ •

**تەرجەمە :**

سەعیدی کوڕی یەسار ئەفەرموێ : لە خذمەت ئیبنوعومەرا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە رێی مەککەدا ئەڕۆییم کـە ترســـام لەوە رۆژببێتەوە دابەزیمو نوێژی وەترم‌کرد ، لـە پاشـا رۆییم تـا پێی‌گەییم • ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لێی‌پرسیم : لە کوێ بووی ؟ وتم : ترســام کە رۆژببێتەوە دابەزیمو وەترم کرد ، فەرمووی : بۆ تۆ چاولێکەریی پێغەمەر ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ نـاکـەی ؟ عەرزم‌کرد : بەڵێ وەڵلاّ • فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە سواری‌یەوە وەتری ئەکرد •

**الجمع تقديماً وتاخيراً[1] :**

٢٥٠٩/١٣ ـ قال ســالم : وأخَّر ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] المغرب ، وكان استصرخ على امرأته صــــفية بنت أبي عبيد ، فقلت له :

---

(١) کۆکردنەوەی = دوو = نوێژ بە پێشخستنو دواخستنی بەگەمیان .

الصلاة • فقال : سر • فقلت : الصلاة • فقال : سر • حتى ســـار ميلين أو ثلاثة ، ثم نزل فصلى • ثم قال : هكذا رأيت النبي ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـ يصلي إذا أعجله السير • = وقال عبدالله : رأيت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا أعجله السير = يؤخر المغرب • فيصـــــليها ثلاثاً ، ثم يسلم ، ثم قلمّا يلبث حتى يقيم العشاء فيصليها ركعتين ثم يســـــلم • ولا يســـبح بعد العشـــاء حتى يقوم من جوف الليل • ح ـ ٢/٢٨٣ • م ـ ٣/٢٧٠ •

**تەرجەمە :**

سالمی کوڕی ئیبنوعومەر ئەفەرموێ : ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ نوێژی مەغریبی دواخست ، خەبەری بۆ نێررابوو کە صـــەفیەی کچی ئەبوعوبەیدی = خێزانیو = [ خوشـــــکی موختاری خاریجیی کەذذاب ] مردوە • عـەرزم‌کـرد : نوێژ • فەرمووی : بـڕۆ • دووبـــارە عەرزم‌کرد : نوێژ • وتی : بڕۆ • تـا دوو میل یا سێ میل ڕێگە ڕۆیی ، لە پاشا دابەزیی نوێژی مەغریبی کرد [ جەمعی کرد لەگەڵ خەوتنانا • أخری ] لە پاشا فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ م وا دی نوێژی ئەکرد ، کە ڕۆیینی بە عەجەلە بوایە • عەبدوللا ـ رضـــي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وســـلم ـ م دی کـە ڕۆیینی عەجەلەی بوایە مەغریبی دوائەخســـــت سێ ڕکاتی ئەکرد ، ئەوەندەی پێ نەئەچوو تـا قامەتی خەوتنان ئەکرا ، دوو ڕکات نوێژی خەوتنانی ئەکرد ، دوای خەوتنان سوننەتی نەئەکرد تـا وەختی نیوەشەو تەشریفی هەڵەستا •

[ نوێژی سێ ڕکاتیی قەصر ناکرێ • سوننەت لە سەفەرا نیە • لـــە ئەووەڵی وەختـا بڕوا ( جمع التأخیر ) ئەکـرێ ، لـە ئاخری وەختـا بڕوا ( جمع التقدیم ) ئەکرێ ] •

٢٥١٠/١٤ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعـالى عنهما ] قـال : قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لنا لما رجع من الأحزاب : لا يصلين أحـــد العصر إلا في بني قريظة ، فأدرك بعضهم العصر في الطريق ، فقال بعضهم : لا نصلي حتى نأتيها ، وقال بعضهم : بل نصلي ، لم يُرد منا ذلك • فذُكر ذلك للنبي ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ فلـم يعنف أحـداً منهم • ح ـ ٣١٦/٦ • ح ـ ١٩٢/٢ • م ـ ٣٨٤/٧ • وفيه : الظهر بدل العصر ،

ظەننم وایە ئەم حەدیثەم لە غەزەواتا یـا لە جیهادا نووسیوە • حەتتـا تەوفیقی عەصرو ظوهریشم کردوە • ئەگەر وابێ لێرە مەینووسن[1] •

٢٥١٢/١٥ ـ أنس بن سيرين قال : استقبلنا أنســاً [ رضي الله تعالى عنه ] حين قدم من الشام فلقيناه بعين التمر ، فرأيته يصــــلي على حمار ، ووجهه من ذا الجانب ، يعني عن يسار القبلة • فقلت : رأيتك تصـلي لغير القبلة ؟ فقال : لولا أني رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فعله لم أفعله • ح ـ ٢٨٥/٢ • م ـ ٤١٢/٣ •

---

(١) بەڵێ راســـــت ئەفەرمووی ، حەدیثی ژمـارە ( ١٣٧٧/٥٤ )ی باسی غەزەواتە . لە لاپەڕە ( ٤١٠ )ی بەرگی چوارەمدا نووسراوە ، بەڵام وەك هەموو جارێك لەبەر تێكنەچوونی ژمارەی حەدیـــــثەكانی كتێبەكە نووسیم . هەروەها لە دوای ئەم حەدیثەوە ژمارە ( ٢٥١٢ )ی بواردوە ئێمەیش ــ وەك هەمیشە وا ئەكەین ــ پەیڕەوی دانەرمان كرد .

**تەرجەمە :**

ئەنەسی کوڕی سیرین ئەفەرموێ : چووین بـە پیـر ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ = کە = تەشریفی لە شام ئەهاتەوە ، لـە ( عين التمر ) پێیگەیین ، سـوـاری گوێدرێژێ بووبوو نوێژی ئەکرد ، ڕووی = لە = لای چەپی قیبلەوە بوو ، عەرزم‌کرد : وامدیت بەرەو غەیری قیبلە نوێژت ئەکرد ؟ فەرمووی : ئەگـەر پێغەمەر ـ صـلى الله تعـالى عليه وسلم ـ م نەدیایە کە وای ئەکرد نەمەکرد •

نوێژی سوننەت بە سواری‌یەوە ڕووی لە هەر کوێ بێ دروستە •

٢٥١٣/١٦ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : صـــلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الظهر والعصر ، [ والمغرب والعشاء بالمدينة في غير خوف ولا مطر • أخرى ] جميعـاً بالمدينـة في غير خوف ولا سفر • قال أبو الزبير : فسألت سعيداً [ بن جبير ] : لِمَ فعل ذلك ؟ فقال : سألت ابن عباس كما سألتني فقـال : أراد أن لا يَحرُجَ أحـداً من أمته • م ـ ٣/٤١٥ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە مەدینەدا بێ ئەمە لە سەفەرا بێ [ یـا باران • أخرى ] یـا ترسی بێ نیوەڕۆو عەصـری بەیەکەوە ئەکرد • ئەبوزوهەیری راویی ئەفەرموێ : لـە سـەعیدی کوڕی جوبەیرم پرسی : بۆچی وای ئەکـرد ؟ فەرمووی : چۆن تۆ لە منت پرسی منیش لە ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ م پرسی فەرمووی : بۆ خاتری ئەمە کە هیچ کەس لە ئوممەتەکەی گوناهبار نەکا •

ظاهیری ، بەڵکو صەراحەتی ، وایە کە جەمع مەخصووص نیـە بـە عوزری سەفەرو بە باران نەخۆشیی ، هەموو وەختێ ئەکرێ • نەوەویی ـ رحمه الله ـ بە هیچ تەئویلێکی رازی نیە • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ کە لە جوابی سەعیدی کوڕی جوبەیرا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وای ویســـــتوە کە ئوممەتەکەی گوناهبار نەبێ ، تەقوی‌یەی دروستبوونی ئەکا • شـــتێك پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیـه وسلم ـ بە وەحی موباحی کردبێ بە ئیجتیهادی هیچ موجتەهیدێ حـەرام نـابێ •

٢٥١٤/١٧ ـ عن معاذ [ رضي الله تعالی عنه ] قال : خرجنا مع رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ في غزوة تبوك فكان یصلي الظهر والعصر جمیعاً والمغرب والعشاء جمیعاً • وفي أخری مثله : قال [ أبو الطفیل ] فقلت : ما حمله علی ذلك ؟ قال : فقال : أراد أن لا یحرج أمته • م ـ ٤١٦/٣ •

٢٥١٥/١٨ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعالی عنهما ] قال : صلیت مع النبي ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ثمانیاً جمیعاً ، وسبعاً جمیعاً • [ قـال عمرو : ] قلت [ لجابر بن زید ] : یا أبا الشـــعثاء أظنه أخر الظهر وعجل العصر ، وأخر المغرب وعجل العشاء ؟ قال : وأنا أظن ذلك • م ـ ٤١٦/٣ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس[1] ـ رضي الله تعـالی عنهما ـ ئەفەرموێ : لـە خذمـەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە مەدینە حەوت رکاتم بەیەکـەوە

---

(١) دانەر ـ خ ـ تەرجەمەی حەدیثەکەی مەعاذی نەنووسی • رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە وەك حەدیثی ( ٢٥١٣/١٦ ) وایە • جیاوازی‌یەکی کەمیـان لە نێواندا هەیە •

کرد [ مەغریبو خەوتنان • أخری ] هەشت رکاتم بەیەکەوە کرد [ نیوەڕۆو عەصر • أخری ] عەمری کوڕی دینار ئەفەرموێ : لە جابیری کوڕی زەیدم پرسی : ئەی ( أبو الشعثاء ) ظەننم وایە نیوەڕۆی دواخستوەو عەصـری هێناوەتە پێشەوە ، مەغریبی دواخستوەو خەوتنانی هێنـاوەتـە پێشـەوە ، فەرمووی : منیش لام وایە •

۲۵۱٦/۱۹ ـ عبدالله بن شقيق قال : خطبنا ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] يوماً بعد العصر حتى غربت الشمس وبـدت النجوم وجعل النـاس يقولون : الصـــلاة ، الصـــلاة • قال فجاءه رجل من بني تميم لا يفتر ولا ينثني : الصـــلاة ، الصـــلاة • فقال ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] : أتعلمني بالسنة لا أم لك ؟ ثم قال : رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ جمع بين الظهر والعصر والمغرب والعشاء • قال عبدالله بن شقيق : فحاك في صدري من ذلك شيء ، فأتيت أبا هريرة [ رضي الله تعالى عنـه ] فسألته فصدق مقالته • م ـ ٤١٧/٣ •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵلای کوڕی شەقیق ـ رحمه الله تعـالى ـ ئەفەرموێ : رۆژێ دوای عەصر عەبدوڵلای کوڕی عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خوطبەی بۆ خوێندین تـا رۆژئاوا بوو و ئەستێرە دەرکەوت خەڵق دەستیان پێکرد ئەیانوت : نوێژە ـ نوێژە • پیاوێ لە بەنی تەمیم هات هیچ ماندوو نەئەبوو نەئەگەڕایەوە هەر ئەیوت : نوێژە ـ نوێژە • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : تۆ من فێری رەوشتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ ئەکەی ؟ دایکت نەبێ ! لە پاشـــا فەرمووی : چاوم کەوت بـــە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نیوەڕۆو عەصری ، شـــــێوانو

خەوتنانی بەیەکەوە جەمع‌کردەوە • عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق ـ رحمه الله تعالى ـ فەرمووی : لەم فەرموودەی ئیبنوعەباسە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ شتێك بەدڵما هات ، یەعنی کە ئیفتیرا بێ ، چوومە لای ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لێم‌پرسیی تەصدیقی قسەکەی ئیبنوعەباسی کــرد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ •

۲۰/۲٥۱۷ ـ أبو أيوب الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ جمع في حجة الوداع المغرب والعشـــاء بالمزدلفة = • ح ـ ۱۹٦/۳ • م ـ ٥/۳۹۳ • ن ، جه • وعن ابن عمر مثله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ • م ـ ٥/۳۹۳ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیــه وسلم ـ لــه ( حجة الوداع )ا لــه موزدەلیفە مەغریب‌و عیشای بە یەکەوە کرد لە بەینیانا نوێژی ســـــونەتی نەکرد •

۲۱/۲٥۱۸ ـ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : جمع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بِجَمْعٍ كل واحدة منهما بإقامة ، ولم يسبح بينهما ، ولا على إثر كل واحدة منهما • ح‌ـ۱۹٦/۳ • م ـ ٥/۳۹٤ بمعناه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى علیــه وســـلم ـ لــه جەمعا [ یەعنی لــه موزدەلیفەدا ] لە بەینی مەغریب‌و خەوتنانا جەمعی‌کرد ، هـــەر یەکـــە بــە قامەتێکی جوێ ، نە لە بەینیانا ســــــونەتی کــرد ، نــە لــە دوایی‌یانا • [ قەسطەلانی مەعناکەی لە ظاهیر لاداوە ، یەعنی لە عەقەب ئەوانەوە نەبکرد،

مەعنای وا نیە کـە هـەر نەیکرد • ئیحتیمالی هـەیـە لــە دوای قەدەرێ کردبێتی ] •

**صـــلاة الخوف**[1] :

قال الله تعـالى : ( وإذا ضربتم في الأرض ) : کـە لـە ئـەرزا ڕۆیین سـەفەرتان کرد ( فليس عليكم جناح ) گوناهتان ناگاتێ ( أن تقصروا من الصلاة) : کە لە نوێژ کورت بکەنەوە ( إن ) : ئەگەر ( خفتم ) : ترستان بێ ( أن يفتنكم الذين كفروا ) : لـەمـە کـە کـافـران تووشی فیتنەتان بکەن ( إن الكافرين ) بە تەحقیق کافران ( كانوا لكم عدواً مبينا ) بۆ ئێوە بوون بە دوشمنێکی زۆر ئاشکارا • ئەم میقدارە دەلیلی قەصـرە • ( وإذا كنت فيهم ) : ئەی محەمەد ئەگەر تۆ لە ناویانا بوویتو ( فأقمت لهم الصلاة ) : نوێژت بۆ کردن ( فلتقم طائفة منهم معك ) : طائیفەیێ لە موســـولمانان لەگەڵ تۆ لە نوێژا بوەستن • ( فليأخذوا أسلحتهم ) : سیلاحیشیان بگرن بەدەستەوە • یەعنی غافڵ نەبن • ( فإذا سجدوا ) : کە ســـوجدەی ڕکاتی ئەووەڵیان برد ( فليكونوا من ورائكم ) : ئەم فیرقەیە بچنە پشـت ئێوەوە تـا موحافەظەتان لـە دوشـــمن بکەن • یەعنی بێ ئەمە کـە لـە نوێژەکە بچنەدەرێ • ( ولتأت طائفة أخرى لم يصلوا ) طائیفەیێکی تر کـە نوێژیان نەکردوە بێن ( فليصلوا معك ) : لەگەڵ ئێوە نوێژ بکەن ( وليأخذوا حذرهم وأسلحتهم ) : ئیحتیاطو خۆپارازتن بکەن لـە دوشمنو ســـــــیلاحیان بەدەستەوە بگرن ( ود الذين كفروا ) : ئەوانەی کە کافر بوون حەزەکەنو تەمەننای ئەوە ئەکەن ( لو تغفلون عن أسلحتكم وأمتعتكم ) : کە ئێوە لـە سیلاحو مەتاعتان غافڵ بین ( فيميلون عليكم ميلة واحدة ) : کە هەموویان

---

(1) نوێژی ترس •

یە جارێ حەملەتان بۆ بێنن‌و رەچەڵەکتان لە بن دەرهێنن ، کە وابێ غافـل مەبن ( ولاجناح علیکم ) : گوناهتان لەسەر نیـــە ( ان کان بکم اذی مـن مطر ) : ئەگەر لە باران ئەذێتێکتان بێ ( أو کنتم مرضی ) : یا نەخۆش بن‌و سیلاح هەڵگرتنتان لەسەر زەحمەت بێ ( أن تضـعوا أسلحتکم ) : کـــە سیلاحەکاتتان دابنێن ( وخذوا حذرکم ) : ئەو وەختەیش غافڵ مەبن‌و وریا بن مەبادا دوشمن هوجوومتان بکەنە ســەر ( إن الله ) : بـە تەحقیق خوا ( أعـد ) : حازرو موهەییای کردوە ( للکافرین )[1] : بۆ کافران ( عذابـاً مهینا ) : عەذابێ کە پێی ذەلیل‌و حەقیر بن •

خوا ـ عز وجل ـ بەم ئاخری ئایەتە وەعدەیان پێ ئەدا کە نەصرەتیان بدا • ئیشارەت بەوەیش ئەکا ئینسان لە حەربا لە هەموو ئیشێکیا وریابێ‌و غافڵ نەبێ زەعیف یـا بە قووەت بن ( نساء ) •

٢٥١٩/١ ـ عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : غزوت مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قبل نجد فوازينا العدو ، فصاففنا لهم ، فقام رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يصلي لنا ، فقامت طائفة معه ، وأقبلت طائفة على العدو • وركع رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ بمن معه وسجد سجدتين ، ثم انصرفوا مكان الطائفة التي لم تصل ، فجاؤا فركع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بهم ركعة وســـجد سجدتين ثم سلم • فقام كل واحد منهم فركع لنفسه ركعة وسجد سجدتين • ح ـ ١٨٧/٢ • م ـ ١٣٤/٤ • د ، ت ، ن •

---

(١) النســـاء/١٠٢ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعومەر ـ رضـي الله تعـالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لـە خـذمـەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ لـە طـەرەف نەجدەوە غەزای [ ذات الرقاع ]م کرد ، بەرابەر بە دوشمن صەفمان بەست • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی راوەستا نوێژی بۆ ئەکردین طائیفەیێ صەفی لـە خذمەتیا بەست لـە نوێژا راوەســـــتان • طائیفەیەکیش روویان‌کردە دوشمن • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆ ئەوانەی کە لە خذمەتیا بوون روکوعێك‌و دوو سوجدەی پێ‌بردن ، ئەوان گەڕانەوە بۆ ســـەر دوشمن ، لـە جێی ئـەو طائیفە کـــە نوێژیان نەکردبوو • ئەو طائیفە هاتن پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وســلم ـ رکاتێکیشی بەوان کردو دوو سوجدەی بردو سەلامی دایەوە ، کوللێ لەو دوو طائیفەیە هەلســانـەوە هەرکەسە بۆ خۆی رکاتێکی کردو دوو سوجدەی برد •

٢٥٢٠/٢ ـ ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] عن النبي ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ وإن كانوا أكثر من ذلك [ فـإن كـان خوف أكثـر من ذلك • م ] فليصلوا قياماً وركبانـاً • ح ـ ١٨٩/٢ ، ن • م ـ ١٣٥/٤ • وفيه : فصـــل راكباً أو قائماً تومىء إيماء • م مســـتقبل القبلة أو غير مستقبلها • موطأ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کـە دوشمن لەوە زیاتر بوون ، یـا فەرمووی : خەوفێ لـەو خەوفە زیاتر بوو بە پێوە ، بـە

ســواريەوە ... هەركەس بۆ خۆى نوێژ بكا ئيما[1] بكا [ بـە روكووعو سوجوود بەرەوهەركوێ بێ ] .

٢٥٢١/٣ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ قال : قام النبي [ رسول الله ] ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وقام الناس معه فكبَّر وكبَّروا معه ، وركع وركع ناس منهم ، ثم سجد وسجدوا معه ، ثم قام للثانية فقـام الذين سجدوا وحرسوا إخوانهم ، وأتت الطائفة الأخرى فركعوا وسجدوا معـه والنـاس كلهم في صـــلاة ، ولكن يحرس بعضـــهم بعضـــا .

ح ـ ٢/١٨٩ ، د ، ن .

**تەرجەمە :**

ئيبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشريفى راوەستا خەڵقيش لە خذمەتيا راوەســـتان ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ( الله أكبر )ى كرد خەڵقيش هەموويان ( الله أكبر )يان كرد ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشريفى چوو بۆ روكووع ، طائيفەيێك لە خەڵق چوون بۆ روكووع ، لـە پاشا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشريفى چوو بۆ سوجدە ، ئەوانەى كــە روكووعيان بردبوو لەگەڵ ئەوا چوون بۆ سوجدە ، لە پاشا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشريفى هەڵســـا بۆ ركاتى دوەم ، ئەوانەى كــە سوجدەيان بردبوو هەڵسان دەستيانكرد بە موحافەظەى برادەرەكانيـان ، طائيفەكەى تر هاتنەجێى ئەمـــانو ئەمـــان چوونـە جێى ئەوان بۆ پاس ، ئەوانيش لەگەڵ پێغەمەرا ـ صـلى الله تعـالى عليـە وســلم ـ روكووعو

(١) واتە بە ئيشارەكردن .

سوجدەیان برد ، خەڵق هەموو لە نوێژا بوون ئەمما بەعزێکیان بەعزێکیانی موحافەظە ئەکرد •

لە حەدیثی پێشەوەدا هەردوو طایفە جوێ - جوێ نوێژیان دابەست • لەم حەدیثەدا هەموو بەیەکەوە نوێژیـان دابەســـــت ئەمما روکووعو سوجدەیان • جوێ - جوێ بوو •

ئەوزاعیی - رحمه الله تعالی - ئەفەرموێ : ئەگەر فەتح موهەییا بوو نزیك بوو بکرێ قودرەتیان نەبوو بەسەر نوێژا بە ئەرکانو ئەفعالیەوە بـە ئیشارەت نوێژ بکەن ، هەرکەس بـۆ خۆی • ئەگـەر بـە ئیمایش بۆیـان مومکین نەبوو تـا شەڕ ئەبڕێتەوە ، یا ئەمین ئەبن نوێژیان دوابخەن ، ئەو وەختە دوو رکات بکەن • ئەگەر مومکینیان نەبوو دوو رکات بکەن نـە ( بالفعل ) نە = بـە = ئیما رکاتێکو دوو سوجدە ببەن ، تەنها ( ألله أكبر ) کردنی کافی نیە ، ئەگەر نەیانتوانی رکاتێکو دوو سوجدە ببەن نوێژەکەیان تەئخیر بخەن تـا ئەمین ئەبنەوە بە دەلیلی حـەربی خـەنـدەق کـە نوێژی عەصریان پێ نەکرا • ح - ٢/١٩٠ •

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - [ وصـلـه ابن ســـــعد ] ئەفەرموێ : حازری موحاصەرەی قەڵای توستەر بووم ، لە وەختی طولووعی فەجـــرا شەڕ بەشیددەت بوو ، نوێژمان نەکرد تـا رۆژ بەرز بۆوە ، لـە خذمـەت ئەبوموسادا بووینو نوێژمانکرد ، ئەمجا قەڵاکەمان بۆ فەتحکرا ، لە باتی ئەو نوێژە دنیاو مافیهایان بدامایە ئەوەندەم لا خۆش نەئەبوو • ئەمما لـە باتی ئەو نوێژە کە چوە ، یا لە باتی قەزاکەی کە فەتحی بەشوێنا هاتبوو ؟ ( أظهرهما الثاني )[1] ح - ٢/١٩٠ •

(١) لە باتی ئەو نوێژە دنیاو .. دوو قســـــە هەڵئەگرێ : مەبەستی نوێژە چوەکەیە یا قەزاکەی ؟ وا دەرەکەوێ دوەمیان مەبەست بێت •

٢٥٢٢/٤ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : صلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلاة الخوف بإحدى الطائفتين ركعة ، والطائفة الأخرى مواجهة العدو ، ثم انصرفوا وقاموا في مقام أصحابهم مقبلين على العدو ، وجاء أولائك ثم صلى بهم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ = ركعة ، ثم سلم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ = ثم قضى هؤلاء ركعة وهؤلاء ركعة • ح ـ ٣٢٣/٦ • م ـ ١٣٤/٤ •

**ئەرجەمە :**

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نوێژی خەوفی کرد بە طائیفەیێ [ لە لەشکرەکەی ] طائیفەکەی تر بەرەوڕووی دوشمن بوون ، لە پاشا ئەوانەی کە نوێژیان ئەکرد گەڕانەوە چوون لە جێی رەفیقەکانیان ، کە بەرابەری دوشمن راوەستان ، روویانکردە دوشمن ، ئەوانە کە لە پێشا بەرابەری دوشمن بوون هاتن ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رکاتێکیشی بەوانکرد = لە پاشا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ سەلامی دایەوە = لە پاشا ئەمان رکاتێكو ئەوان رکاتێکیان کرد •

٢٥٢٣/٥ ـ جابر بن عبدالله [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : شهدت مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلاة الخوف فصفنا صفين : صف خلف رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ والعدو بيننا وبين القبلة • وكبر النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وكبرنا جميعاً ، ثم ركع وركعنا جميعاً ، ثم رفع رأسه من الركوع ورفعنا جميعاً ، ثم انحدر بالسجود والصف الذي يليه ، وقام الصف المؤخر في نحر العدو فلما قضى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وقام الصف الذي يليه انحدر الصف المؤخر

في الركعة الأولى ، وقام الصـــف المؤخر في نحر العـدو • فلما قضى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ السجود والصف الذي يليه انحدر الصـف المؤخر بالسجود فســـجدوا ثم سلم النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وسـلمنا جميعاً • قـال جابر : كما يصـــنع حرسكم هؤلاء بأمرائهم • م ـ ٤/١٣٥ •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خذمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى علیـه وسـلم ـ حازری نوێژی خەوف بووم ، بووین[1] بـە دوو صەف صەفەفێکمان لە پشت پێغەمەرەوە ـ صلى الله تعالى علیه وســلم ـ [ یەعنی صەفێکیشمان لە دوای ئەو صەفەوە بووین ] دوشـــمن لە بەینی ئێمەو قیبلەدا بوو ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ ( الله أكبر )ی کرد ، ئێمەیش هەموومان ( الله أكبر )مان کرد ، پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى علیه وسلم ـ روکووعی برد ، ئێمەیش هەموومان روکووعمان برد ، ئـەو سەری لە روکووع بەرزکردەوە ، ئێمەیش سەرمان بەرزکـــردەوە • ئەو تەشریفی دانەویەوە صەفی پشت ئەویش دانەویەوە ، صــــەفی دوایی بەرابەر دوشمن وەســـتا ، کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وســلم ـ سوجدەی تەواوکردو ئەو صەفەیش کە لە پشتیەوە بوون ســـــوجدەیان تەواوکردو هەڵسانەوە صەفی دوایی چوونە سوجدەو هەڵسانەوە ، لە پاشا صەف ئاڵوگۆڕ کرا : هەموو پێشەوە چوونە دواوە ، هەموو دواوە هاتنە

(١) دانەر ـ خ ـ بە هەڵە لـە دەقە عەرەبییەکەدا لـە باتی ( فصــفنا ـ فصففنا )ی نووسیبو لێرەیشدا بەو جۆرە مانای کردوە ، بەڵام دەبێ لە باتی ( بووین ـ کردینی ) بێ •

پێشەوە ، لە پاشا پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - روکووعی بردو ئێمەیش هەموومان روکووعمان برد ، ئەو هەڵسایەوە ئێمەیش هەموومان هەڵساینەوە ، ئەو تەشریفی چوە سوجدەو ، ئەو صەفەیش کە ئێستە لە پشت ئەوەنو لە پێشا لە دواوەبوون لە رکاتی ئەووەڵا چوونە سوجدە ، صەفی دواوە [ کە لە پێشا لە پێشەوە بوون ] بەرابەر بە دوشمن وەستان ، کە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - و ئەو صەفەی کە لە پشتیەوە بوونو لە رکاتی ئەووەڵا لە دواوە بوون سوجدەیان برد ، کە لە سوجدە بوونەوە صەفی دواوەیش چوونە سوجدە لە پاشا پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - سەلامی دایەوەو ئێمەیش هەموومان سەلامان دایەوە • جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : وەك ئومەراکانتان نوێژ بە غەزاییەکانتان ئەکەن لە غەزادا •

٢٥٢٤/٦ - وعنه قال : غزونا مع رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قوماً من جهينة ، فقاتلونا قتالاً شديداً ، فلما صلينا الظهر قال المشركون : لو ملنا عليهم ميلة واحدة لاقتطعناهم • فأخبر جبريل رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - ذلك ، فذكر ذلك لنا رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : وقالوا : إنه ستأتيهم صلاة هي أحب إليهم من الأولاد ، فلما حضرت العصر قال صفنا صفين ، والمشركون بيننا وبين القبلة ، قال : فكبر رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - وكبرنا ، وركع وركعنا ، ثم سجد وسجد معه الصف الأول ، فلما قاموا سجد الصف بالسجود وقاموا ، ثم تقدم الصف المؤخر وتأخر الصف المقدم ، ثم ركع النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - وركعنا جميعاً ، ثم رفع رأسه من الركوع ورفعنا جميعاً ، ثم انحدر بالسجود والصف الذي يليه ، الذي كان مؤخراً

الثاني ، ثم تأخر الصف الأول وتقدم الصف الثاني ، فقاموا مقـام الأول ، فـكبر رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وكبرنـا ، وركـع وركعنا ، ثم سجد وسجد معه الصف الأول وقام الثاني ، فلما سجد سجد الصـــف الثاني ثم جلسوا جميعاً ، ثم سلم عليهم رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ • قال أبو الزبير : ثم خص جابر أن قال : كما يصـــــلي أمراؤكم هؤلاء • م - ١٣٧/٤ •

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئەفەرموێ : غەزای قەومێکمان لـە جوهەینە کرد ، شەڕێکی زۆر بەشیددەتیان کرد ، کە نوێژی نیوەڕۆمـــان کرد موشریکەکان وتیان : ئەگەر بە یەك دەفعە بماندایە بەسەریانا لە رەگمان دەرەهێنان • جیبریل ـ علیه الســـلام ـ خەبەری دا بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ و ئەویش خەبەری دا بـە ئێمە ، موشریکەکان وتیان : نوێژێکیان بۆ بێت کە لە ئەولاد لە لایان خۆشەویستره [ یەعنی ئەو وەختە ئەدەین بە سەریانا ] کە نوێژی عەصر هات بووین بـە دوو صـــــەف ، موشریکان لە بەینی ئێمەو قیبلەدا بوون ، پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى علیـه وسلم ـ ( الله أكبر )ی کرد ئێمەیش ( الله أكبر )مان کرد ، روکووعی بـرد روکووعمان برد ، سوجدەی برد صەفی پێشـەوە سوجدەیان لەگەڵ ئـەو برد ، کە هەڵسانەوە صەفی دوەم سوجدەیان برد ، لە پاشا جێ گۆرکێیان کرد ، صەفی دوەم لە جێی صەفی ئەووەڵ وەستان ، پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى علیه وسلم ـ ( الله أكبر )ی کـرد ئێمەیش کـردمـان ، وەك رکـاتی ئەووەڵ ، ئەمجا هەموو دانیشتین پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسـلم ـ سەلامی لێ کردن ••• ( إلخ )

٢٥٢٤/٧ ـ عن سهل أبي خَيْثمة [ رضي الله سعالى عنه ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صلى بأصحابه في الخوف ؛ فصفهم خلفه صفين ، فصلى بالذين يلونه ركعة ثم قام ، فلم يزل قائماً حتى صـلى الذين خلفهم ركعة ثم تقدموا وتأخر الذين كانوا قدامهم ، فصـــلى بهم ركعة ، ثم قعد حتى صـــلى الذين تخلفوا ركعة ، ثم ســـلم • م ـ ١٣٨/٤ • ح ـ ٣٢٢/٦ بالمعنى •

٢٥٢٥/٨ ـ عن صالح بن خوّات عمن شهد مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوم ذات الرقاع صلى صلاة الخوف أن طائفة صفت معه وطائفة وجاه العدو ، فصـلى بالتي معه ركعـة ، ثم ثبت قائماً وأتمـــوا لأنفسهم ، ثم انصرفوا فصفوا وجاه العدو وجاءت الطائفة الأخرى فصلى بهم الركعة التي بقيت [ من صلاته ] ثم ثبت جالساً ، وأتموا لأنفسهم ثم سـلم بهم • ح ـ ٣٢١/٦ • م ـ ١٣٨/٤ • د ، ت ، جه ، ن •

**تەرجەمە :**

ئەم حەدیثانە هەموو یەك حادیثەن مەئالیان یەكێكە وەك حەدیثەكانی جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ •

٢٥٢٦/٩ ـ عن جابر [ رضي الله تعالى عنه ] قال : أقبلنا مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حتى إذا كنا بذات الرقاع قال : كنا إذا أتينـا على شجرة ظليلة تركناها لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قـال : فجاء رجل من المشركين وسيف رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ معلق بشجرة ، فأخذ ســـيف رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فاخترطه [ سله من الغمد ] فقال لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : أتخافني ؟ قال : لا • قال : فمن يمنعك مني ؟ قال : الله يمنعني منك • قال :

فتهدده أصحاب رسول الله – صلى الله تعالى عليه وسلم – فأغمد السـيف وعلقه • قال : فنودي بالصلاة ، فصلى بطائفة ركعتين ، ثم تأخروا وصلى بالطائفة الأخرى ركعتين • قال : فكانت لرسول الله – صلى الله تعالى عليه وسلم – أربع ركعات وللقوم ركعتان • م – ٤/١٤٠ • م – ٩/١٤٥ بێ ( صلاة الخوف ) • ح – ٥/٤٥٣ • ح – ٦/٣٢٤ • عن أبي بشر : اسم الرجل غورث ، وقاتَل فيها محارب خصفة [ وعند الواقدي : أنه أسـلم ورجع إلى قومه ، فاهتدى به خلق كثير ] •

**تەرجەمە :**

ئەم حەدیثە لە شەجاعەتی پێغەمەرا – صلى الله تعالى عليه وسلم – تـا بەحثی نوێژی نووسراوەو تەرجـەمـە کراوە • مـەئـالی دوایییەکەی ئەوەیە : پێغەمەر – صلى الله تعالى عليه وسلم – لەو غەزایەدا چوار رکاتی کرد ، لە دوو رکاتی ئەووەڵا طائیفەیێ دوو رکاتیان لەگەڵ کردو سەلامیان دایەوە چوون بەرابەر بە دوشمن راوەستان ، لــە دوو رکـــاتی ئاخریـا طائیفەکەی تر هاتن نوێژیان لەگەڵ پێغەمەر – صلى الله تعالى عليه وسلم – کـرد •

**تم الخوف وجاء الأمن باذن الله تعالى**

١٠/٦/١٩٤١ سێ شەممە

ئەو رۆژە کە هەموو خەڵق موسوڵمانی کامڵ بوونو بە ( رأي العين ) قیامەتیان لە پێش چاو بووە ، نوێژێکیان چووبێ لەوەی کـە کورێکیان بمرێ لە لایان ناخۆشتر بووەو ، شەڕی تیرو شیرو گورزو کەمەند بوە ، کە بەو نەوعە نوێژیان کردبێ ، ئیمرۆ کە لە صـــەد یەکێ بڕوای بە هیچ

دینێك‌و ئاخیرەت نیەو ، لای وایە کە تۆپی ئەبڕێتەوە ، ئەوانەیشی کـــە بڕوایان هەیە لە صەد یەکێکی نوێژ ناکاو ، شەڕیش وەك خوا - عز وجل - لە ( الرحمن )ا خەبەری لێداوەو فەرموویەتی : ( یرسل علیکما شواظ من نـار ونحــاس فلا تنتصـــران )[1] شەڕی بۆمبـایـەو ( تحت البحر )و ( زرخلیو ! )[2] تۆپ‌و تفەنگ‌و رەهێلی[3] بۆمبایە • بـە چ نەوعێ لـەو نەوعە حەربەدا خەڵق نوێژ بکا ؟ نە بە ئیما نە بە خەیاڵیش نـاتوانن نوێـژ بکەن ! ( الجواب محول بملا سلام[4] - سلمه الله تعالی - ) •

## تـم طبـــع الجزء الســادس من الكتـــــاب

## ویلیـــه الجـــزء الســـــابع

**ان شـــــــــــاء الله**



(١) الرحمن/٣٥ •

(٢) ئەم وشەم بۆ نەخوێنرایەوە وەك خۆی روونووسم کرد .

(٣) ئەم وشە وەك ( زەرلی ) نووسراوە نازانم مەبەستی چیە .

(٤) مامۆستا مەلا سەلام هیچی بۆ ئەم باســـــە نەنووسیوەو ، منیش وەك خۆی هێشتمەوە ؛ چونکە باســـەکە تازەیەو ئیجتیهادی زانای مەزنی دەوێ .

# بابەتو سەرباسەکانی بەرگی شەشەم

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ٦٢ | لە کاتی هێرشدا پێغەمەر ـ ص ـ لە هەر شـــوێنی دەنگی بانگی بیستایە وازی لێ ئەهێنان ٠ |
| ٦٣ | داوای ( وەسیلە ) بۆ پێغەمەر ـ ص ـ |
| ٦٤ | پێغەمەر ـ ص ـ کە بانگی بیستوە چی فەرموە ؟ |
| ٦٥ | بانگوێژان لە قیامەتا گەردنبەرزترینی هەموو خەڵقن |
| ٦٦ | خێری بانگدانو صەفی یەکەم |
| ٦٧ | چەند نموونەی شەهید |
| ٦٧ | شەیتان کە دەنگی بانگی بیست تا رەوحا ناوەستێ |
| ٦٨ | کە شەیتان دەنگی بانگی بیست رائەکاو ئەتڕێ ! |
| ٦٨ | نوێژی کاتی قوڕو باران |
| ٦٩ | لە نێوانی هەر بانگو قامەتێکا نوێژێ هەیە |
| ٧٠ | دووکەس لە سەفەرا بوون چۆن نوێژ ئەکەن ؟ |
| ٧٠ | نوێژی شەوی تەڕو تووشیی |
| ٧٢ | کە نوێژ بوو یەکێ بانگدەداو بەتەمەنیان پێش ئەکەوێ |
| ٧٣ | روکنەکانی نوێژ |
| ٧٤ | نییەت لـە نوێژا |
| ٧٥ | دانانی دەستی راست لەسەر چەپ |
| ٧٦ | ( بسم الله الرحمن الرحيم ) لە نوێژا |
| ٧٧ | پێغەمەر ـ ص ـ لە نێوان ( الله أكبر )و قیرائەتا چی ئەخوێند ؟ |
| ٧٨ | پێغەمەر ـ ص ـ لە نیوەڕۆو عەصرا قورئانی ئەخوێند ؟ |
| ٧٩ | سوورەتی فاتیحە لە نوێژا |
| ٧٩ | سەعدی کوڕی ئەبووەقاصو نوێژکردن |
| ٨٢ | سەعدو دۆعاگیرابوونی |

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ٨٣ | شێوەی نوێژی پێغەمەر ـ ص ـ |
| ٨٥ | ئەندازەی قورئان خوێندنی پێغەمەر ـ ص ـ لە نوێژا |
| ٨٧ | ( قل أوحي )و گوێڕاگرتنی جین بۆ نوێژی پێغەمەر |
| ٨٩ | پێغەمەر ـ ص ـ کە لە نوێژا کۆکەگرتی چی کرد ؟ |
| ٩٠ | قورئان خوێندنی عومەرو ، ئەحنەفەو ، ئیبنومەسـعوود لە نوێژا • |
| ٩١ | لەسەرخۆیی لە نوێژا |
| ٩٣ | کە ئیبنوعەباس ( والمرسلات )ی خوێند |
| ٩٣ | جارێکی دیکە قورئانخوێندنی پێغەمەر ـ ص ـ لە نوێژدا |
| ٩٥ | دروستە دوو سوورەت لە رکاتێکا بخوێنرێ |
| ٩٩ | ئـەو سوورەتانەی کـە پێغەمەر ـ ص ـ بەیەکـەوە لە نوێژا ئەیخوێندن • |
| ١٠١ | لەگەڵ ئامینی ئیماما ئامین بکەن |
| ١٠٢ | سوورەتی فاتیحا خوێندن لە دوای ئیمامەوە |
| ١٠٤ | ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانو خوێندنی(بسم الله الرحمن الرحيم) |
| ١٠٥ | دۆعای ( توجه ) |
| ١٠٦ | دەبێ ئیمام بۆ حاڵی نوێژکەران بڕوانێو قورئان کەم بخوێنێ |
| ١٠٩ | پێغەمەر ـ ص ـ تووڕە بووە لەوانەی کە نوێژ درێژئەکەنەوە |
| ١١١ | پێغەمەر ـ ص ـ کە گریانی منداڵی بیسـتوە نوێژی کورت کردۆتەوە • |
| ١١٢ | خێری ( الله أكبر كبيرا ، والحمد لله كثيرا ، وسـبحان الله بكرة وأصيلا ) • |

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| | **قیـامو قیرائەتو ڕوکووعو سوجوود** |

| لاپەڕە | بابـــــــەت |
|---|---|
| ١٣٦ | خوێندنی ( سبحانك وبحمدك لا إله الا أنت ) |
| ١٣٧ | ستایشی پێغەمبەر – ص – |
| ١٣٧ | بە لێکەوتنی ژنو پیاو دەزنوێژ ئەشکێ ؟ |
| ١٣٨ | گەورەیی سوجدە |
| ١٤٠ | سەربەستن لە نوێژا |
| ١٤١ | پێغەمەر – ص – کە سوجدەی ئەبرد چۆن دەستی دائەنا ؟ |
| ١٤٢ | روکووع ، سوجوود ، ئیعتیدال ( جلوس بین السجدتین ) |
| ١٤٣ | قونووت |
| ١٤٤ | دۆعاکردن لە کافران |
| ١٤٦ | دۆعاکردنی پێغەمەر – ص – لە ریعلو ذەکوانو عوصەییە |
| ١٤٧ | قونووت دوای روکووعە یا پێش روکووع ؟ |
| ١٤٩ | قونووت لە مەغریبو بەیانیدا |
| ١٥٢ | جارێکی دیکە دۆعاکردن لە ریعلو ... |
| ١٥٤ | جێی قونووتو دەلیلی قونووت |

صیفەتی صەلات ـ تەشەهود

| لاپەڕە | بابـــــــەت |
|---|---|
| ١٥٥ | چوارمەشقیی‌دانیشتن لە تەحییاتا |
| ١٥٦ | ئەبوحەمیدی ساعیدییو گێڕانەوەی نوێژی پێغەمەر – ص – |
| ١٥٧ | مەڵێن سەلام لەسەر خوا |
| ١٥٩ | پێغەمەر – ص – وەك چۆن سوورەتێکی قورئانی فێرئەکردین وایش تەحییاتی فێرئەکردین |
| ١٦٠ | شێوەی تەحییات |
| ١٦١ | دۆعاکردن پێش سەلامدانەوە |

| لاپەڕە | بـــابـــــەت |
|---|---|
| ١٦٣ | پێغەمەر – ص – دوای سەلامدانەوە کەمێك ئەوەستا تا ژنان بڵاوەبکەن • |
| ١٦٤ | کلیلی نوێژ |
| ١٦٤ | بە دەنگی ( الله أكبر )کردن زانراوە کە پێغەمەر – ص – لـە نوێژ بوەتەوە • |
| ١٦٥ | کە هەژارەکان چوونە لای پێغەمەر – ص – چی فێرکردن ؟ |
| ١٦٨ | لەفظی جەمیعو مەجموع |
| ١٦٩ | تەسبیحاتی دوای نوێژ |
| ١٧١ | وتنی ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ) لە دوای نوێژ |
| ١٧٢ | بە چ لایەکدا سەلام دەدرێتەوە ؟ |
| ١٧٤ | نوێژکەر شوێنکەوتووی ئیمامەو وەك ئەو ئەکا |
| ١٧٥ | صەلاتو سەلام لەسەر پێغەمەر – ص – |
| ١٨٠ | چۆن سەلام ئەکرێ ؟ |
| ١٨٢ | دانیشتن بۆ دۆعا |
| ١٨٣ | سوجدەی سەهو بۆ تەحییاتی ئەووەڵ |
| ١٨٤ | پێغەمەر – ص – چۆن سەلامی نوێژی داوەتەوە ؟ |
| ١٨٥ | پەناگرتن بە خودا لە سزای گۆڕ لە نوێژا |
| ١٨٧ | پەناگرتن بە خودا لە چوارشت لە نوێژا |
| ١٨٧ | پێغەمەر – ص – دوای سەلامدانەوە چەندە دائەنیشت ؟ |

**نوێژی جەماعـەت**

| | |
|---|---|
| ١٨٩ | کوێریش چاوساغی بێ بۆی نیە لە جەماعەت دواکەوێ |
| ١٩٠ | هەر هەنگاوێکی چوون بۆ مزگەوت چاکەیێکە |

| لاپەڕە | بـــابــــــــەت |
| --- | --- |

## جومعــــە

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ٢٢٥ | درێژیی نوێژو کورتی خوطبە |
| ٢٢٦ | دەستبەرزنەکردنەوە لە خوطبەدا |
| ٢٢٧ | پێغەمەر ـ ص ـ کـە خوطبەی بدایـە چاوی سوور ئەبۆوەو دەنگی ••• |
| ٢٢٨ | شێوەی خوطبەی پێغەمەر ـ ص ـ |
| ٢٢٩ | جۆرەکانی بیدعەت |
| ٢٢٩ | یەکەم جومعە لە دوای جومعەی مزگەوتی پێغەمەر ـ ص ـ |
| ٢٣٠ | جومعەی روزەیق‌و حەدیثی ( کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیتە ) • |
| ٢٣١ | پێغەمەر ـ ص ـ سوورەتی قافی لەسەر مینبەر خوێندوە |
| ٢٣٣ | پێغەمەر ـ ص ـ ( ونادوا یا مالك )ی لەسەر مینبەر خوێندوە |
| ٢٣٣ | ضیماد چۆن بە خوطبەی پێغەمەر ـ ص ـ باوەڕی هێنا ؟ |
| ٢٣٥ | کاتی جومعە |
| ٢٣٦ | پێغەمەر ـ ص ـ بۆ گەرماو سەرما کاتی جومعەی گۆڕیوە |
| ٢٣٦ | نابێ یەکێ یەکێك لە شوێنی خۆی هەڵســـــێنێ‌و خۆی لـە شوێنی دانیشێ • |
| ٢٣٧ | پێغەمەر ـ ص ـ بەیانیی جومعە ( ألم تنزیل )و ( هل أتی علی الانسان )ی خوێندوە • |
| ٢٣٨ | عوثمان بانگی دوەمی جومعەی دامەزراند |
| ٢٣٩ | چۆن جوابی بانگ ئەدرێتەوە ؟ |
| ٢٤٠ | دوای جومعە بۆ سێبەری دیوار گەڕاون پیا بڕۆن |

| لاپەڕە | بــابـــــەت |
|---|---|

| لاپەڕە | بـــابــــــــەت |
|---|---|

## بـاب الدعـــوات

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|

| لاپەڕە | بابـــــــەت |
|---|---|
| ٣٢١ | خودا بە شەو دەستی کەرەمی درێژ ئەکا تـا گوناهباری ڕۆژ تەوبە بکا • |
| ٣٢٢ | حوکمی تەوبەی پێش غەرغەرە |
| ٣٢٣ | هیچ کەس لە خودا ستایشی پێ خۆشتر نیە |
| ٣٢٣ | غیرەتی خوا بۆ موسوڵمان ئەوەیە کە موسوڵمان گوناه بکا |
| ٣٢٥ | پیاوێك ( ٩٩ ) کەسی کوشتو کردی بـە صـــەدو تەوبەی کرد ••• |
| ٣٢٦ | گوناهی موسوڵمان ئەخرێتە ئەستۆی گاورو جوو |

**النوافـــل**

| لاپەڕە | بابـــــــەت |
|---|---|
| ٣٢٨ | دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی |
| ٣٢٩ | کە قامەت کرا بۆ نوێژی بەیانی سوننەت ناکرێ |
| ٣٣١ | ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ص ـ بە سێ شـــــت ئەمری پێفەرمووم ••• |
| ٣٣١ | کەسێ ویردی شەو نەخوێنێو بەیانی بیخوێنێ وەك ئەوە وایە کە شەو خوێندبێتی • |
| ٣٣٢ | نوێژی ئەووابین کاتێکە کە گەرمی زەویی پێی بێچوە وشتر بسووتێنێ • |
| ٣٣٢ | نوێژ لە ماڵەکانتانا بکەنو مەیکەن بە قەبر |
| ٣٣٣ | سوورەی بەقەرە لە ماڵەکانتانا بخوێنن |
| ٣٣٣ | پێغەمەر ـ ص ـ وەتری پێش نوێژی بەیانی کردوە |
| ٣٣٤ | دوو رکات سوننەتی مزگەوت |
| ٣٣٥ | نوێژی چێشتەنگاو |

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ٣٣٨ | پێغەمەر ـ ص ـ لە نوێژی بەیانیدا چی خوێندوە ؟ |
| ٣٤٠ | پوختەی باسی نوێژی چێشتەنگاو |
| ٣٤١ | رواتب اليوم والليلة |
| ٣٤٤ | ئەندازەی شەونوێژی پێغەمەر ـ ص ـ |
| ٣٤٥ | ئەگەر کەسێ ترسی بوو خەبەری نەیێتەوە پێش خەوتن وەتر بکا • |
| ٣٤٦ | پێغەمەر ـ ص ـ کە شەو بۆ شەونوێژ هەڵبسایە چی ئەکرد ؟ |
| ٣٤٨ | پێغەمەر ـ ص ـ لە شەونوێژدا چەندی قورئان خوێندوە ؟ |
| ٣٥٠ | پێغەمەر ـ ص ـ کە شەو وەتری ئەکرد حەزرەتی عایشەیشی هەڵەسان • |
| ٣٥١ | ئەگەر کەسێك لە شەونوێژ یا لە قورئان خوێندندا خەوی هات با واز بێنێ‌و بخەوێ • |
| ٣٥١ | پێغەمەر ـ ص ـ لە نێوان هەموو دوو رکاتێکا سەلامی داوەتەوە • |
| ٣٥٢ | پێغەمەر ـ ص ـ پێش نوێژی بەیانی دوو رکات سوننەتی کردوەو لەسەر لای راستی راکشاوە تا قامەت کراوە • |
| ٣٥٥ | سەعدی کوڕی هیشام لە شەونوێژو رەفتاری پێغەمەر ـ ص ـ دەپرسێ • |
| ٣٥٩ | پێغەمەر ـ ص ـ لە هەموو کاتێکی شەوا وەتری کردوە |
| ٣٦٠ | وەتر بە سواری‌یەوە دروستە |
| ٣٦٠ | پێغەمەر ـ ص ـ لە دوایی تەمەنیا بە دانیشتنەوە شەونوێژی کردوە • |
| ٣٦٢ | نوێژ بە پێیانەوەو بە دانیشتنەوە |

| لاپەڕە | بابـــــەت |
|---|---|
| ٣٦٢ | ( حمالة الحطب )و شەونوێژی پێغەمەر ــ ص ــ |
| ٣٦٣ | پێغەمەر ــ ص ــ عەلی‌و فاطیمە بۆ شەونوێژ هەڵدەستێنێ |
| ٣٦٤ | پێغەمەر ــ ص ــ لە شەونوێژا راوەستاوە تا قاچی ئاوساوە ! |
| ٣٦٤ | کام کردەوە لای پێغەمەر ــ ص ــ پەسەند بوە ؟ |
| ٣٦٥ | پێغەمەر ــ ص ــ بە نوستوویی لای عائیشە رۆژی لێ بوەتەوە |
| ٣٦٦ | هەرکەسێ نوست شەیتان سێ گرێ لە پشت‌سەری ئەدا |
| ٣٦٧ | هەرکەسێ نوێژی بەیانی نەکا شەیتان میزی کردوەتە گوێیەوە |
| ٣٦٧ | باسێکی دیکەی شەونوێژی پێغەمەر ــ ص ــ |
| ٣٦٨ | عیبادەت لەسەر ذەوق‌و بەگوێرەی توانا ئەبێ |
| ٣٦٩ | کاتی لەخەوخەبەربوونەوەی شەو دۆعاو نوێژ قەبووڵ ئەبێ |
| ٣٦٩ | چەند بەیتێکی عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە |
| ٣٧٠ | دیسان شەونوێژی پێغەمەر ــ ص ــ |
| ٣٧١ | وەتر لە شەوێکدا هەر یەك جار دەکرێ |
| ٣٧٢ | ئیبنوعەباس لە شەونوێژی پێغەمەر ــ ص ــ دەگەڕێ |
| ٣٧٣ | نوێژی تەراویح |
| ٣٧٤ | بە شێوەیەك عیبادەت بکەن کە بۆتان بەڕێوەببرێ |
| ٣٧٥ | پێغەمەر ــ ص ــ لە تەراویح دواکەوتوە مەبادا فەرزبکرێت |
| ٣٧٨ | ئەنجامی حەدیثەکانی بابی تەراویح |
| ٣٨٠ | دوو رکات دوای عەصرو دوو رکات پێش شێوان |
| ٣٨٤ | صلاة الاستخارة |

| لاپەڕە | بابـــــــەت |
|---|---|
| ٤١٥ | سوجدە لە ( والنجم )ا |
| ٤١٦ | سوجدە لە ( إذا السماء انشقت )دا |
| ٤١٨ | سوجدەی ( ص ) |
| ٤١٥ | عومەرو سوجدەی تیلاوەت |

**نوێژی کۆچەری ـ صــلاة المسافر ـ**

| | |
|---|---|
| ٤٢١ | نوێژ لە پێشدا دوو ڕکات فەرزکرا ••• |
| ٤٢٢ | ئیمامی عوثمانو نوێژی سەفەر |
| ٤٢٣ | ئایەتی ( فليس عليكم جناح أن تقصروا من الصلاة ••• ) |
| ٤٢٣ | نوێژی دانیشتوو و سەفەرییو ترس |
| ٤٢٥ | ئیمامی عوثمان لە مینادا چۆن نوێژی پێکردن ؟ |
| ٤٢٦ | پێغەمەر ـ ص ـ لە ( حجة الوداع )ا چۆن نوێژی کرد ؟ |
| ٤٢٧ | لە چەنداو تا چەند نوێژ کورت دەکرێتەوە ؟ |
| ٤٢٩ | کۆکردنەوەی دوو نوێژ بە پێشخستنو دواخستنی یەکەمیان |
| ٤٣٢ | پێغەمەر ـ ص ـ مەغریبو عیشای لە مەدینەدا بێ ســـەبەب یەکخستوە • |
| ٤٣٤ | ئیبنوعەباسو کۆکردنەوەی نوێژ |
| ٤٣٥ | پێغەمــەر ـ ص ـ لــە موزدەلیفەدا لــە کۆکردنەوەی نوێـژا سونەتی نەکردوە • |
| ٤٣٦ | صــلاة الخوف |
| ٤٣٩ | ئیبنوعەباس نوێژی ترس دەگێڕێتەوە • |

طبع على نفقة المرحوم الحاج محمود البنية وأولاده

# إقتران النيرين
# في
# مجمع البحرين

تاليف

ملا رشيد بيگه بابان

تحقيق

محمد علي القره‌داغي

المجلد السادس

يُوزَع مجاناً

دار الحرية للطباعة والنشر

١٤٠٩هـ ١٩٨٨م